# زەوی تەخت و جێگیر

## لە ڕووانگەی قورئان و سوننەت

نووسینی: محمد عثمان فائق

پێداچوونەوەی: مامۆستا هەڵۆ حەمە ڕەشید

ساڵی : 1444 هـ

# (زەوی تەخت و جێگیر لەڕوانگەی قورئان و سوننەت)

نووسینی : محمد عثمان فائق

پێداچوونەوەی : مامۆستا هەڵۆ حەمە ڕەشید

إنَّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيِّئات أعمالنا من يهده الله فلا مُضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد ألاَّ إله إلاَّ الله وحده لا شريك له وأشهد أنَّ محمَّدًا عبده ورسوله ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَ اتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا. يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ وبعد : فإنَّ أصدق الحديث كلام الله وخير الهدي هدي محمَّد صلَّى الله عليه وسلَّم وشرَّ الأمور محدثاتها وكلَّ محدثة بدعة وكلَّ بدعة ضلالة وكلَّ ضلالة في النار .

پاش سوپاس و پێزانین بۆ الله و صەلاوات لەسەر پێغەمبەری ئەزیزمان (صل الله علیه وسلم) پێشکیەک لە کتێبەکات دەخەینە ڕوو ، کتێبی (زەوی تەخت و جێگیر لەڕووانگەی قورئان و سوننەت) ، دەڵێین بەڕاستی و بە بێگوومان لە کارە پێشینەکانی مرۆڤی مسوڵمان تێڕامانە لەو بەڵگە و ئایات و نیشانانەی سەبارەت بە دروستکراوەکانی الله سبحانه وتعلى لەقورئانی پیرۆز و أحادیثی شەریفی رسول الله (صل الله عیه وسلم) ڕوون کراوەتەوە ، بێگوومان لەگەورەترین دروستکراوەکانی زاتی الله (جل جلاله) بریتیە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی ، وەك زاتی خۆیان (سبحانه وتعلى) دەفەرموون : (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ) واتە : (بە دڵنیایی لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی نێوان شەو و ڕۆژ لە تاریکی و ڕووناکی و لە کورتی و درێژی و لە ساردی و گەرمی و لە هێمنی و ئارامی و قەرەباڵغی ئەمانە هەمووی بەڵگەی ڕوون و ئاشکران لەسەر تاك و تەنهایی و توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە بۆ کەسانێك کە خاوەنی عەقڵێکی ڕاستو ساغو سەلیمو تەواو بن) ، وە چەندەها ئایەتی دیکەش کە هاتوون سەبارەت بە گەورەیی دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی ، ئەمەش شتێکی حاشا هەڵنەگرە چونکە ئاسمانەکان و زەوی تەواوی مەخلوقاتی اللهیان لەخۆ گرتووە ، ئاسمانەکان پێک هاتووە لە حەوت چین ئاسمان وەک خۆیان (جل جلاله) لە دەیان ئایەت باسیان لێوەکردووە ، وەک دەفەرموێت : (أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا) واتە : (ئایا نابینن کە خوای گەورە حەوت ئاسمانی دروست کردووە چین لەسەر چین ئاسمان لەسەر ئاسمان وە ڕایگرتووە) وە لەناو ئەم ئاسمانانەدا زاتی خۆی چەند و چۆن وویستی لێ فەرموویێت ئەوەندە لە مەخلوقاتی خۆی جێ کردۆتەوە لە : (مەلائیکە ، هەسارەکان ، خۆر ، مانگ ، ئەستێرەکان ، بورجەکان ، خولگەکان ...) الله اعلم ، وە هەروەها زەویشی تەرخان کردووە وەک جێگەیەک بۆ ژیان بۆ مەخلوقاتەکانی هەر لە : (انس و جن و تەواوی بوونەوەرە وشکەوەرییەکان و ئاوییەکان و .... الله اعلم لەبوونی چەندها جۆر بوونەوەری دیکە) ، الله سبحانه وتعلى دەفەرموێت : (الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) واتە : (ئەو خوایەی کە زەوی بۆ جێگیر کردوونو ڕاخستوون وەکو بێشکەیەك وە لە زەویشدا ڕێگای زۆری بۆ داناون تا تیایدا بڕۆن و بڕۆن بەڵکو بەرژەوەندی خۆتان بدۆزنەوەو وەکو ڕێنماییەك بۆتان) وە هەروەها دەفەرمووێت : (وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ) واتە : (وە خوای گەورە زەویشی داناوە و ڕاخستووە بۆ مرۆڤەکان) لێرەوە وەك ئاماژەمان پێدا الله جل جلاله ئەم زەوییە بەپیت و فەڕ و بەرەکەتەی

وەبەرهێناوە بۆ بەندەکانی کە تێیدا بژین ببێتە لانکە بۆیان و بمرین و تێیدا بنێژرێین و زیندووبکرێینەوە وەك خۆیان دەفەرمووێت : (قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ) واتە : (هەر لەسەر زەویدا ژیان بەسەر ئەبەن ئەژین، وە هەر لەوێش ئەمرن، وە لەناو زەوی لە گۆڕەکانتان لە ڕۆژی قیامەت جارێکی تر دەرئەکرێنەوە) ، وە هەروەها هەریەک لە تەنە ئاسمانییەکانی ڕاسپاردووە بە کار و کردەوەیەک ، وە تەواویانی ڕام هێناوە بۆ خزمەتکردنی مرۆڤەکان لەسەر زەوی ، وەک خۆیان دەفەرموون : (وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ) واتە : (وە خوای گەورە شەو و ڕۆژو خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی بۆ ژێربار کردووەن و لە ژێر فەرمانی خوای گەورەدان بە گوێرەی بەرژەوەندی ئێوە دێن و ئەڕۆن بە دڵنیایی هەموو ئەم دروستکراوە گەورانەی خوای گەورە نیشانەن لەسەر دەسەڵات و گەورەیی و تاك و تەنهایی خوای گەورە کە تاك و تەنهاو بێ شەریکە بەڵام بۆ کەسانێك کە عەقڵیان هەبێ و بیر بکەنەوە) ، جا سەبارەت بە کاروباری خۆر و مانگ دەفەرموون : (وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا) واتە : (وە ئێمە شەو و ڕۆژمان داناوە کە دوو نیشانەن وە روناکی و نیشانەکەی شەومان کوژاندۆتەوە کە مانگە بەڵام نیشانەکەی ڕۆژ بینراوە کە خۆرەو بەڕۆژ ڕووناکە تا بەهۆی ڕووناکی ڕۆژەوە بە دوای بژێوی ژیانتاندا بگەڕێن ، وە بەهۆی تاریکی شەوەوە پشووی تیا بدەن وە تا بەهۆی شەو و ڕۆژو مانگ و خۆرەوە ژمارەو حسابو مێژووی خۆتان بزانن وە ئێمە درێژەمان بە هەموو شتێك داوەو ڕوونمان کردۆتەوە) وەك دیارە خۆر کراوە بە نیشانەی ڕۆژ و مانگیش بە نیشانەی شەو ، هەریەکەشیان بە هەژمارێکی تایبەت بەخۆیان کە الله وویستی لەسەرە دێن و دەڕۆن و دەجووڵێن هەریەکەیان بە قەبارەی تایبەت بەخۆی و ڕووناکی تایبەت بە خۆی ، وەک زاتی خۆیان دەفەرموون : (هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) واتە : (خوای گەورە ئەو خوایەیە وای لە خۆر کردووە کە ڕووناك و گەرم بێت وە وای لە مانگ کردووە کە تەنها ڕووناك بێت وە ڕۆیشتنی مانگی تەقدیر کردووە پلە پلەیە هەر لە شەو و ڕۆژێکدا جووڵەیەك ئەکات سەرەتا بچوکە پاشان گەورە دەبێتو کامڵا دەبێت پاشان لە کۆتایی مانگدا کەم دەکاتەوە بۆ ئەوەی کە ئێوە بەهۆی خۆرەوە ژمارەی ڕۆژەکان بزانن ، وە بەهۆی مانگەوە ژمارەی مانگو ساڵەکان و حسابی خۆتان بزانن خوای

گەورە ئەم شتەی دروست نەکردووە تەنها بەحەق نەبێ وە ئایەتەکانی خۆی درێژە پێ ئەدات و ڕوونی ئەکاتەوە بۆ کەسانێك کە ئەم شتانە بزانن) ، وە سەبارەت بە ئەستێرەکان دەفەرموون : (وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) واتە : (وە خوای گەورە ئەو خوایەیە کە ئەستێرەکانیشی بۆ ئێوە دروست کردووە تا ڕێگای خۆتانی پێ بدۆزنەوە لە تاریکیەکانی شەودا لە وشکانی و دەریادا ، هەروەها بۆ جوانی ئاسمان و ڕەجمکردنی شەیتانەکانیشە وە ئایەتەکانی خۆمان ڕوون کردۆتەوەو درێژەمان پێداوە بۆ کەسانێك کە بزانن و زانیاریان هەبێت) ، ئەگەر بهێنین و تەواوی آیاتەکانی قورئان سەبارەت بە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی پەیوەستە پێوەی بهێنین زۆر دەکێشێت ، ئەمانەی باسمان کرد پێشەکیەکی کەم بوو لەبارەی گەورەیی ئاسمانەکان و زەوی ، وە وەڵامێک بۆ ئەو بەڕێزانەی دەپرسن کە ئایا قسەکردن لەم باسە چ سوودی هەیە ، بەڵێ سوودی زۆرە ، چونکە تۆ قسە لەسەر گەورەترینی مەخلوقاتەکانی الله دەکەیت ، الله دەفەرموویت : (لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ) واتە : (بە دڵنیایی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویەکان زۆر گەورەترە لە دروستکردنی خەڵکی ئیتر بۆ ئیمان ناهێنن بە خوای گەورەو باوەڕ بە زیندوو بوونەوە ناکەن ، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم شتە نازانن یان دان بە گەورەیی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورەدا نانێن) جائایا دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی لەدرووستکردنی ئێمەی نەوەی آدم کە ڕێزمان لێ گیراوە بەسەر تەواوی مخلوقات گەورەتربێت ئایا قسەکردن لەسەری نرخی نیە ؟... بێگوومان ئێمەی إنسان مكلف کراوین کە شووێن زانست و علم بکەوین و هەوڵی فێربوون بدەین تا لەتوانماندا هەیە نەوەک خاوەنی ئەو هزر و فەلسەفەیە بین کە ئێمە تەنها دەبێت بخۆین و بخۆینەوە و بخەوین .

## ئایا زەوی جێگیرە یاخود دەجووڵێت ؟

بە باشم زانی ناوەڕۆکی کتێبەکەتان بکەمە دوو بەشەوە ، سەرەتا وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە ئایا زەوی جێگیرە یاخوود دەجووڵێت بەو شێوەیەی ئەمڕۆ دەگوترێت ، بێگوومان لەدێر زەمانەوە بابەتی جوڵەی زەوی جێگەی مشتومڕو لێکۆڵینەوە بووە لەنێوان فەیلەسووفەکان و زانایانی گەردوون و ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوەیان کردووە لە بابەتەکانی فەلەکدا کە لە زمانی عەرەبی پێیان دەگووترێت : (اهل الهیئة) ، سەرەتا پێش ئەوەی بڕۆینە ناو وەڵامەکەوە ئاشناتان دەکەم بە دوو دەستەواژە کە ئەوانیش بریتین لە دەستەواژەکانی :

1.هێلیۆسنتریك (Heliocentric) : بریتیە لەو تیۆرییە کە پێی وایە خۆر ناوەڕاستی سیستمێکە ، ئەو سیستمەش پێک هاتووە لە نۆ هەسارە کە خاوەنی خولگەی بازنەیین بە دەوری خۆردا و هەریەکەیان بە هەژمارێکی تایبەت دەجوڵێن و لەناویاندا زەوی لە خولگەی چوارەمە کە خاوەنی دوو جوڵەیە (خولانەوە بەدەوری خۆیدا بۆ درووستبوونی شەو و ڕۆژ وە سوڕانەوە بەدەوری خۆردا بۆ درووستبوونی وەرزەکانی ساڵ) وە زەوی بە 360 ڕۆژ خولێکی بەدەوری خۆردا تەواو دەکات و دەکاتە ساڵێک ، ئەم تیۆرییە یەکەم کەس کە خستیە ڕوو بریتی بوو لە (نیکۆلاس کۆپەرنیکۆس) ی پۆڵەندی ، لەپاشان پشتگیری کرا لە لایەن (گالیلۆ و کیپلەر و نیوتن و چەندانی تر) وە تا ئێستاش پەیڕەوی ئەم تیۆرییە دەکرێت بۆ تێگەیشتن لەو سیستمە گەردوونییەی کە زەوی لەخۆ گرتووە و لە فێرگە و خوێندگەکان و زانکۆکان و ناوەندە ئاسمانی و فەلەکیەکان پشتی دەگیرێت .

2.جیۆسنتریك (Geocentric) : لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێت (نظام بطلمي ، نظام مرکزیة الارض) ئەم تیۆرییە یەکەمین تیۆری بوو لەم بارەیەوە پەی پێبرا واتە پێش تیۆری هێلیۆسنتریك بوو ، کە پێی وایە زەوی ناوەڕاستی سیستمەکەمانە وە خۆر و مانگ و تەواوی هەسارەکان بە خولگەیەکی بازنەیی بە دەوری زەویدان و هەریەک بە هەژمارێک دەسووڕێتەوە بەدەوی زەوی وە خۆر بە 360 ڕۆژ خولێک تەواو دەکات بەدەوری زەویدا کە دەکاتە ساڵێک ، واتە پێچەوانەی ئەوەی سەرێ کە ووتمان ، خاوەنی ئەم تیۆرییە بریتی بوو لە (بەتلیمۆس) وە پشتگیری کرا لە لایەن فەیلەسووف (ئەرستۆ و چەندانی تر) وە تەواوی ماتماتیکی و فەلەکناسە مسوڵمانەکان پشتگیرییان بۆ ئەم تیۆرییە دەربڕی بوو وە لە کتێبەکانیاندا ئاماژەییان بۆ کردووە لەوانە : (مسعودي و خوارزمي و ... جگە لەوانیش) ، بەڵام ئەم تیۆرییە لەساڵی 1543 (زاینی) ڕووبەڕوویی یەکەمین تەحەددا بۆیەوە لەلایەن کۆپەرنیکۆسی پۆڵەندی کە گووتی نەخێر خۆر سەنتەرە و ناجوڵێت نەک زەوی و ئەوەی جیۆسنتریك دەیڵێت گشتی بە پێچەوانەوەیە ، جا دوایی بڵاوبوونەوەی ئەم تیۆرییەی کۆپەرنیکۆس ، کەنیسە هێرشێکی توونندییان کردە سەر کۆپەرنیک ، بە بیانووی ئەوەی کافر بووە بە ئینجیل چونکە ئینجیل ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی خۆر دەجووڵێت نەک زەوی ، بۆیە قۆناغ بە قۆناغ کەوتنە دژایەتی کردنی ، وە دژایەتیەکەش بەوە دەستی پێکرد هەستان بە لەناوبردنی کتێبەکانی لەناوەندە زانستییەکان وە بە جۆرەها شێوە ئەوییان ناشرین دەکرد لای خەڵکی ، بەهەرحاڵ لە سەدەی دووی کۆچی بەدواوە پاش ئەوەی وردە وردە جوڵانەوەی وەرگێڕان دەستی کرد بە وەرگێڕانی

پەڕتووکە عەرەبییەکان بۆ یۆنانی و ئینگلیزی و بەپێچەوانەشەوە ، زانا ماتماتیکی و فەلەکیەکانی ڕۆژهەڵات کاریگەری ئەو تیۆری و فەلسەفە ڕۆژئاواییانەیان کەوتە سەر کە لەسەردەمی زێڕینی زانست و مەعریفەتی سەردەمی عەبباسی و ئەمەوییەکان بەردەوام بوو ، وە بەتایبەت لەبواری فتلەك زانا فەلەکناسەکانی ڕۆژهەڵات پێشوازییەکی گەرمیان لەم تیۆرییەی بەتلیمۆس کرد و هەستان بە پشت ڕاستکردنەوەی تیۆرییەکە بە پراکتیکی ، لەو زانایانەش بریتین لە:

1.(المسعودي) ناوی تەواوی بریتیە لە (ابوالحسن علي بن حسين المسعودي) کە لەساڵی (345 هـ) کۆچی دوایی کردووە ، لە کتێبەکەی بەناوی (التنبيه و الاشراف) لە پەڕەی 9 ئاماژە بەوە دەکات کە زەوی سەنتەری سیستمێکە بە ناوی جیۆسنتریك و خۆر لەخولگەی چوارەمە بەدەوریدا و دەڵێت : (فأولها كرة الارض يحيط بها فلك القمر ويحيط بفلك القمر العطارد وبفلك عطارد فلك الزهرة وبفلك الزهرة فلك الشمس) واتە : (سەرەتا گۆیی زەوییە پاشان خولگەی مانگ دەوری داوە پاشان خولگەی عەتارد پاشان زوهرە پاشان خۆر) پاشان دەڵێت : (والارض في وسط الجميع مركز كالنقطة في وسط الدائرة) واتە : (زەوی لەناوەڕاستی هەموویاندایە وەک نوکتەیەک لەناوەڕاستی بازنەیەکدابێت).

2.(القزويني) ناوی تەواوی بریتیە لە (زكريا بن محمد القزويني) لە ساڵی (506 هـ) لەدایک بووە ، لەکتێبەکەی بەناوی (عجائب المخلوقات) پەڕەی 27 ئاماژە بەوە دەدات کە خۆر لەخولگەی چوارەمە لەسیستمی زەوییدا و دەڵێت : (الشمس هي اعظم الكواكب جرما ، واشدها ضوءاَ ، ومكانها الطبيعي الكرة الرابعة) واتە : (خۆر گەورەترینی هەسارەکان لەڕووی تەنییەوە ، وە ڕووناکترینیانە وە شووێنەکەشی بریتیە لە تۆپی چوارەم) وە لەپەڕەی 26 ئاماژەش دەدات بەوەی کە جوڵەکەی لەخۆرهەڵات بەرەو خۆر ئاوایە کە بە 360 جار لەم جوڵەیە ساڵێک درووست دەبێت ، ئەوەتا دەڵێت : (ودورتها من المشرق الى المغرب تتم في ثلاث مائة وستين يوما وربع يوم) .

جگە لەمانیش زۆری دیکە هەمان بابەتیان ڕوونکردۆتەوە لەوانیش (ابن رشد لە مەقالەکەی سەبارەت بە جوڵەی فەلەك ، وە ابن الوردي و خوارزمي و ... چەندانی دیکەش) ، ئەمانەی گووتمان تا ڕادەیەک لەلایەنە گشتییەکەوە ، ئەی ئایا قورئان و سوننەت ئاماژەییان بۆ ئەم بابەتە کردووە ؟ ئایا هیچ کام لەم دوو تێڕوانینەیان پشت ڕاست کردۆتەوە ؟ ئایا زانایانی

مسوڵمان (جگە لەوانەی ووتمان چونکە ئەوان فەلەکی بوون) هیچ ئاماژەیان بەم باسە کردووە لە کۆن و تازەدا ؟ لەگەڵمان بن بۆ وەڵام دانەوە .

## ئایا لە قورئاندا زەوی بە وەستاوی باسکراوە یان بە جوڵاوی ؟

باسە گرنگەکە لێرەوە دەست پێ دەکات ، پێش وەڵامدانەوە هەڵدەستم بە پێدانی دوو دانە تێبینی بۆ تۆی خوێنەری بەڕێز:

1.بابەتەکەمان تا ئێستا شێوەی زەوی نیە ، بەڵکو بابەتی ئەوەیە کە ئایا زەوی دەجوڵێت یان وەستاوە وە ئایا جوڵەی خۆر هۆکاری دروستبوونی شەو و ڕۆژە یان جوڵەی زەوی ، وە ئەو دوو تیۆرییەی باسمان کرد هەردووکیان لەسەر ئەوە کۆڕان کە زەوی گۆییە بەڵام (هێلیۆسنتریك) پێی وایە خۆر سەنتەرە و زەوی لە خولگەی چوارەمە و سوڕانەوەی زەوی هۆکاری دروستبوونی شەو و ڕۆژ و وەرزەکان بریتیە لە جوڵەی زەوی (خولانەوەی بەدەوری خۆیدا بۆ دروستبوونی شەو و ڕۆژ وە سوڕانەوەی بەدەوری خۆردا بۆ دروستبوونی وەرزەکان) وە (جیۆسنتریك) پێی وایە زەوی سەنتەرە و خۆر لە خولگەی چوارەمە و بە سوڕانەوەی بەدەوری زەوی و بەرز و نزمی کردنی لەخولگەکەی شەو و ڕۆژ و وەرزەکان درووست دەبێت ، بەڵام لەو خاڵەدا هاوڕان کە زەوی گۆییە ، وە ئەو فەلەکناسە مسوڵمانانەی ووتیشمان بەهەمان شێوە هاوڕان لەسەر گۆیی بوونی زەوی .

2.وەک ڕوونە ئێمە بابەتەکە لەلایەنی شەرعەوە ڕوون دەکەینەوە بۆیە دەبێت ڕەچاوی قاعیدەی خستنەڕووی (ادلة) واتە : (بەڵگە) بکەین ، کە دەبێت سەرەتا بە پێدانی بەڵگە قورئانیەکان پاشان سوونەت پاشان اجماع دەست پێ بکەین ، جا بۆیە سەرەتا بە لەتێڕوانینی قورئانی پیرۆزەوە دەست دەکەین بە شیکردنەوەی بابەتەکە .

دەڵێین : بەبەڵگەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ، زەوی وەستاوە وە خۆر و مانگ و تەواوی هەسارە و ئەستێرەکان لەجوڵەدان ، بڕوانە هەریەکە لە ئایەتی 2 ی سورەتی (الرعد) وە ئایەتی 13 ی سورەتی (فاطر) وە ئایەتی 29 ی سورەتی (لقمان) وە ئایەتی 5 ی سورەتی (الزمر) ئەم ئایەتە پیرۆزە چواربارە بۆتەوە : (وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِيَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى)

واتە : (وە خۆر و مانگمان ڕام هێناوە و بەدی هێناوە هەریەکەیان تا ئەو کاتەی بۆیان دیاریکراوە دێن و دەڕۆن) ئوسوڵ وایە لەهێنانەوەی ئایەت شێوەی بەبەڵگەهێناوە بخەیتە ڕوو ، کە پێی دەووترێت : (وجه الاستدلال) ، ئەم ئایەتە بە دوو شێوە و ڕوو بەبەڵگە دێنینەوە :

1.ئایەتەکە چواربارە بۆتەوە باسی خۆر و مانگ دەکات کە دەڕۆن ، کەوایە خۆر و مانگ جوڵۆکن .
2.ئایەتەکە چواربارە بۆتەوە و باسی ئەو شتانە دەکات کە الله موسەخخەری کردوون بۆ جوڵە ، باسی زەوی تێدانیە کەوایە زەوی ناجوڵێت .
3.ئیمامی موفەسسیرین (ابن جرير الطبري) لەتەفسیری یەکێك لەو چوار ئایەتە کە ئایەتی 2 ی سورەتی (الرعد) ە دەڵێت : (وأجرى الشمس والقمر في السماء ، فسخرهما فيها لمصالح خلقه وذللهما لمنافعهم ليعلموا بجريهما فيها عدد السنين والحساب ويفصلوا به بين الليل والنهار) واتە : (وە خۆر و مانگی خستۆتە گەڕ لەئاسمان و ئیش دەکەن لەپێناو بەرژەوەندی بەندەکان تا لەڕێگەی سوڕانەوەی خۆر و مانگ کاتەکانی ساڵ و بەروار بزانن و شەو و ڕۆژ جیابکەنەوە)
وە هەروەها ئایەتێکی دیکەمان هەیە بە سەڕیحی کە باسی جوڵەی خۆر دەکات ، کە الله سبحانە وتعلى لە سورەتی (يس) ئایەتی 38 دەفەرموویت : (وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ) واتە : (وە خۆریش لە جوڵەی خۆی بەردەوامە تا ئەگاتە مەنزڵ ئەمەش بڕیاری اللەی زاڵی زانایە) شێوازی بە بەڵگەهێنانەوە : (بەهەمان شێوە ئەم ئایەتە سەڕیحە موحکەمەمان هەیە کە باس لەجوڵەی خۆر دەکات لەکاتێکا تاکە ئایەتێکیش نیە باس لە جوڵەی زەوی بکات بەناڕوونیش بێت) ، وە لە ئایەتی 5 ی سورەتی (الرحمن) دەفەرمووێت : (ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ) واتە : (خۆر و مانگ بە حسابێکی زۆر ورد دێن و دەچن) شێوازی بەبەڵگەهێنانەوە : (دیسان باسی خۆر و مانگی کرد ، بەگوێرەی تیۆری هێلیۆسنتریك بێت گوایە زەوی سێ جوڵەی هەیە ، خولانەوەی لەماوەی 24 کاژێر وە بە 360 ڕۆژ دەسوڕێتەوە بەدەوری زەوی وە بەشێوازی حەلەزۆنیش دێت و دەڕوات بەدەوری خۆر کە خۆریش دەڕوات ، باشە ئەم جوڵانەی زەوی ورد و درشتترە یان هی مانگ ؟ بێگوومان هی زەوی ، ئەی بۆ ئەم ئایەتە باسی زەوی نەکرد ؟) ، وە دوو ئایەتی دیکەمان هەیە کە إعجازییەکان (ئەوانەی ئایەتی قورئان دائەتاشن بۆ خزمەت بەناو زانستەکانی ڕۆژئاوا) دەیکەنە بەڵگە کە گوایە زەوی دەسوڕێتەوە دەڵێن الله لە دوو ئایەت فەرموویەتی : (وكل في فلك يسبحون) واتە : (هەموو ئەوەی لەفەلەکدایە دەسووڕێنەوە) جا بە دوو خاڵ وەڵامیان دەدەمەوە :
1.ڕاست ناکەن ، ئەو ئایەتە بە واتای (هەموو ئەوەی لەفەلەکدایە دەسووڕێتەوە) نایات ، بۆچی ئایەتەکەتان قرتاندووە ؟ یەکیان لەسورەتی الانبياء ئایەتی 33 دەفەرمووێت : (وَهُوَ

ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلَّیۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ كُلࣱّ فِی فَلَكࣲ یَسۡبَحُونَ) واتە : (وە هەر ئەو خوایەیە کە شەو و ڕۆژی دروست کردووە وە خۆرو مانگیش دروست کردووە هەریەك لەوان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە) بڕوانە ئایەتەکە ووشەی زەوی هەرتێدانیە بەڵکوو باسی (خۆر و مانگ و شەو و ڕۆژ دەکات) ئەم چوارە دەسووڕێنەوە ، وە گەر بڕوانین ووشەی (کل) هاتووە ، (کل) لەهەموو حاڵەتێکدا بەمانای (هەموو) نایات بەڵکوو وەک حاشا هەڵنەگرە لە زانستی (النحو) ی زمانی عەرەبی وە تەواوی زانایانی نەحو باسیان کردووە کە جۆرێک لە تەنوین هەیە بە ناوی تەنوینی (عوض) واتە (تەنوینی شووێنگرەوە) کە دەچێتە سەر ووشەی (کل) ، کاتێک ئەم تەنوینە چۆیە سەر (کل) ئەوا (کل) لەوێدا بە واتای ئەو ناوانە دێت کە لەپێش خۆی هاتوون نەک بەواتای (هەموو) ئێستا لەو ئایەتەدا (کل) تەنوینی (عوض)ی لەسەرە واتە (کل) ئەو چوار ناوەی پێش خۆی دەگرێتەوە (الشمس و القمر و الیل و النهار) واتە : خۆر و مانگ و شەو و ڕۆژ ، وەک لە تەفسیری (الجلالین) هاتووە تەفسیری ئەو ئایەتە : (تَنْوِينه عِوَض عَنْ الْمُضاف إلَيْهِ مِن الشَّمْس والقَمَر) واتە : (تەنوینەکەی تەنوینی عوض ە کە دەگەڕێتەوە بۆ مضاف الیە کە خۆر و مانگە) ، وە غەیری ئەمەش لەتەفسیرەکاندا ئاماژەیان پێ کراوە ، وە ئیمامی موفەسیرین (ابن جریر الطبري) لەتەفسیری ئایەتەکەدا دەڵێت : (والله الذي خلق لكم أيها الناس الليل والنهار نعمة منه عليكم وحجة ودلالة عظيم سلطانه وأن الألوهة له دون كل ما سواه فهما يختلفان عليكم لصلاح معايشكم وأمور دنياكم وآخرتكم وخلق الشمس والقمر أيضا ﴿كُلࣱّ فِی فَلَكࣲ یَسۡبَحُونَ﴾ يقول :كلذلك في فلك يسبحون)

واتە : (الله ئەو زاتەیە کە شەو و ڕۆژی بۆ ئێوە درووست کردووە خەڵکینە کە نیعمەتە بۆ ئێوەو بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و دەسەڵاتی ئەو وە ئەو شەو و ڕۆژە جیاوازییان هەیە بەپێی بەرژەوەندی و چاکەی ئێوە وە خۆر و مانگیشی درووست کردووە وە کە دەشفەرموێت : ﴿كُلࣱّ فِی فَلَكࣲ یَسۡبَحُونَ﴾ واتە : هەریەک لەوانە دەسووڕێنەوە) وە ئیمامی (القرطبي) لەتەفسیری ئایەتەکە دەڵێت : (كُلٌّ يَعْنِي مِنَ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ وَالنُّجُومِ وَالْكَوَاكِبِ وَاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ (فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ) أَيْ يَجْرُونَ وَيَسِيرُونَ بِسُرْعَةٍ كَالسَّابِحِ فِي الْمَاءِ) واتە : (کل بەواتای ئەوە دێت خۆر و مانگ و هەسارەکان و ئەستێرەکان و شەو و ڕۆژ دەسووڕێنەوە و دەڕۆن بەخێرایی وە مەلەوانێک لە ئاودا) وە ئیمامی (القرطبي) هەر لەتەسیری ئەم ئایەتە پشت ڕاستی ئەوە دەکاتەوە کە خۆر خولگەی هەیە نەک زەوی ئەوەتا دەڵێت : (وَالْأَصَحُّ أَنَّ السَّيَّارَةَ تَجْرِي فِي الْفَلَكِ، وهي سبعة أفلاك دون السموات الْمُطْبِقَةِ، الَّتِي هِيَ مَجَالُ الْمَلَائِكَةِ وَأَسْبَابُ الْمَلَكُوتِ،

فَالْقَمَرُ فِي الْفَلَكِ الْأَدْنَى، ثُمَّ عُطَارِدُ، ثُمَّ الزُّهْرَةُ، ثُمَّ الشَّمْسُ، ثُمَّ الْمَرِّيخُ، ثُمَّ الْمُشْتَرِي ثُمَّ زُحَلُ)
واته : (ڕاسترین ڕا ئەوەیە کە هەسارەکان لەخولگەدا دەڕۆن ، کە حەوت خولگەیە و پەیوەست نیە بە ئاسمانەکان ، واتە کە دەڵێین حەوت خولگە مەبەستمان حەوت ئاسمانەکە نیە کە تایبەتە بە فریشتەکان ، ئەم خولگانەش مانگ نزمترینیانە پاشان عەتارد پاشان زوهرە پاشان خۆر پاشان مەریخ پاشان زوحەل) وە ئیمامی (القرطبي) یەکێکە لەو زانایانەش کە کۆدەنگی زانایان نەقڵ دەکات لەسەر ئەوەی زەوی جێگیرە (دوایی باسی دەکەین) ، وەک دەرکەوت ئەم زانایانە و بە تەحەدداوە هیچ کام لە اهلی تەفسیر باسی ئەوەیان نەکردووە کە ئەم ئایەتە زەوی بگرێتەوە چونکە ئەسڵەن زەوی لەفەلەک و خولگەدا نیە ، جا پێش کۆتایی هێنان بەو ئایەتانەی باس لە سوڕانەوەی زەوی دەکەن و بچینە سەر ئەو ئایەتانەی باس لە زەوی دەکەن کە جێگیرە دەمەوێت چوار تێبینی بخەمە ڕووی بۆ ئێوەی بەڕێز :
1.وەک دیارە دەڵێین لەسەریٚ کە شەو و ڕۆژ دەسووڕێتەوە ، الله یارمەتی دەربێت لەکاتی درووستکردنی کتێبێک لەسەر ئەم باسە لەلایەنی زانستی باس لەوە دەکەین کەشەو و ڕۆژ دوو درووستکراوی جودان لە خۆر و مانگ ، واتە ڕۆژ و شەو تاریکی و ڕووناکین پەیوەست نین بە خۆرەوە و ئەوانیش بەسەر زەوییە دێن و دەڕۆن وەک دوو چین الله بەدیهێناون.
2.ئەو بابەتە زمانەوانییەی باسمان کردووە (تنوين عوض) لەتەواوی کتێبە نەحوییەکان باس کراوە لە بابی (علامات الاسم) ، بەنموونە بڕوانە کتێبی (شرح ابن عقيل) جوزئی 1 پەڕەی 22 وە کتێبی (جامع دروس العربية) جوزئی 1 پەڕەی پەڕەی10.
3.وە وەك ووتمان دوو ئایەتن کە جوملەی (كل في فلك يسبحون) تێیدا هاتووە ئێمە یەکیمان ڕوون کردەوە ئەوەی دیکە دەکەوێتە سورەتی (يس) ئایەتی 40 : (لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ) واتە : (نەخۆر بۆی هەیە پێش مانگ بکەوێت نە شەویش پێش ڕۆژ بکەوێت و هەریەک لەمان لە خولگەی خۆیان دەسووڕێنەوە) ئەمەیان ئەسڵەن قسەی ناوێت چونکە (كل) حەرفی (واو) ی عەطف لەپێشیەوە هاتووە واتە (كل) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ناوانەی لەپێشی هاتووە کە دووبارە بریتین لە خۆر و مانگ و شەو و ڕۆژ .
4.زۆر سەیرە ، سەیری تەرجومە کوردیەکانیش دەکەیت هیچیان نەیوتووە کە مەبەست لەو ئایەتە زەویش دەگرێتەوە ، مەبەست ئەوە نیە بڵێین پشت ببەستین بە تەرجومە کوردییەکانی قورئان تاوەکو تەفسیری اهلی علم مابێت بەس مەبەستم ئەوەیە ئەوەی وادەڵێت بەس الله

خۆی بزانێت ئەو تەئویلە سەقەتە بێ مانایەی لەکوێ هێناوە .
پاشان ئەگەر بێینە سەر ئایەتەکانی کە لەسەر زەوی هاتوون ، دەبینین الله دەفەرمووێت لەسورەتی (النمل) ئایەتی 61 : (أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَايَعْلَمُونَ)
واتە : (کێیە کە ئەم زەویەی جێگیر کردووەو ناجولێت و ناهەژێت وە لە ناویشیدا ئەو هەموو ڕووبارو ئاوەی داناوە وە شاخیشی وەکو مێخ بە زەویدا داکوتیوە بۆ ئەوەی نەجوولێ و نەهەژێ وە لە نێوان دوو دەریاکە یەکیان شۆرە و یەکیان شیرینە خوای گەورە پەردەی داناوە کە بە چاو نابینرێ یان زەوی داناوە و نایەلێ ئەو دوو ئاوە تێکەڵ بێت ئایا لەگەڵ ئەم الله یە کە ئەم توانا و دەسەڵاتەی هەیە خوایەکی تر هەیە کە شایەنی پەرستن بێت وە بتوانێ ئەم شتانە بکات تا ئێوە بیکەن بە شەریك بۆ خوا ، بێگومان نەخێر بەڵام زۆربەی زۆریان یەکخواپەرستی خوای گەورەو تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە نازانن) وە ئیمامی (إبن كثير) لەتەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت : (أَيْ: قَارَّةً سَاكِنَةً ثَابِتَةً لَا تَمِيدُ وَلَا تَتَحَرَّكُ بِأَهْلِهَا وَلَا تَرْجُفُ بِهِمْ فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ كَذَلِكَ لَمَا طَابَ عَلَيْهَا الْعَيْشُ وَالْحَيَاةُ بَلْ جَعَلَهَا مِنْ فَضْلِهِ وَرَحْمَتِهِ مِهَادًا بِسَاطًا ثَابِتَةً لَا تَتَزَلْزَلُ وَلَا تَتَحَرَّكُ) واتە : (واتەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە زەوی جێگەیەکی وەستاوی جێگیرە ناجوڵێتەوە وە خەڵکەکەی سەری ناهەژێنێت جا گەر وابوایە ژیان مانای نەدەبوو بەڵکو بە گەورەیی خۆی زەوی گێڕاوە بە لانکە و ڕاخەرێکی وەستاو و جێگیر و نەجوڵاو) وە هەروەها الله سبحانه وتعلى دووبارە لە ئایەتێکی دیکە دەفەرمووێت : (ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ) واتە : خودا زاتێکە کە زەوی بۆ جێگیر کردوون وە ئاسمانیشی بۆ کردوون بە سەربان و بە جوانترین شێوە ئێوەی دروست کردووە لەوەش حەلاڵ و پاکە ڕۆزی داوون ئەمەیە خوای پەروەردگاری ئێوە ، بەرزی و پیرۆزی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان) هەروەها ئایەتێکی دیکەمان هەیە الله دەفەرمووێت : (إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّن بَعْدِهِۦٓ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا) واتە : (بەڕاستی خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیر دەکات بۆ ئەوەی نەجوڵێن ئەگەر بجوڵێن و لابدەن کێ هەیە جگە خوا ڕایان بگرێت بێگومان الله لەسەرخۆ و لێبوردەیە) لەم ئایەتە ڕوون و ئاشکرایە الله دەفەرمووێت ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیرکردووە کە نەجوڵێن ، لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا وەک امامی ابن جرير و ابن منذر و سعيد بن منصور و عبد بن حميد ڕیوایەتی دەکەن لە شەقیق ەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کە کەعبی احبار پێی

گوتووە گوایە ئاسمان دەسووڕێتەوە و ئەم قسەیە بە صەحابی بەڕێز (ابن مسعود) دەڵێت ، لەبەرامبەردا ابن مسعود دەفەرمووێت (كَذَبَ كَعْبٌ إنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّماواتِ والأرْضَ أنْ تَزُولا﴾ وكَفى بِها زَوالًا أنْ تَدُورَ) واتە : (کەعب درۆی کرد ئەوەتا الله دەفەرمووێت ئاسمان و زەویم ڕاگرتووە نەجوڵێت ، کەوایە ناسوڕێتەوە) جا دیقەت بدەن ئایەتەکە ئاسمان و زەویشی تێدایە جا ابن مسعود دەفەرمووێت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئاسمان ناسووڕێتەوە ، دەی بەڵگە بێت لەسەر نەسوڕانی ئاسمان بەڵگەشە لەسەر نەسوڕانی زەوی چونکە ئایەتەکە هەردووکیانی تیایە ، ئەم ئەثەرەش لەتەواوی تەفسیرەکاندا تێیدایە تەفسیری ئەو ئایەتە (تەفسیری الطبري و القرطبي و ابن كثير و البغوي .... هەموو ئەوانی تریش) ، جا لەم ئایەتانەی هێنامانەوە بەتەواوی بەڵگەن لەسەر ئەوەی خۆر و مانگ دەجوڵێن و زەوی وەستاوە ، تا ئێرە باسەکەمان شێوەی زەوی نیە ، ئێستا دەرۆینە سەر بەشی دواتر ، ئەویش ئەو بەڵگانەی لە سوننەتدا هاتووە سەبارەت بەم باسە و دەیکەین بە بەشێکی سەربەخۆ تاوەکو تێکەڵ نەبێت لەتۆی خوێنەری بەڕێز

## بەڵگەکانی سوننەت لەسەر جێگیریی زەوی

وەك سەرەتا ئاماژەمان پێدا اسڵ و اسوڵ وەهایە لەشەرعدا سەرەتا استدلال بکرێت بە ئایەتەکانی قورئان پاشان احادیث ، ئێستا دێینە سەر ئەو حەدیثانەی بەڵگەن لەسەر جێگیربوونی زەوی ، بێگومان چەند حەدیثێکمان هەیە بەڵام من سیانیانم گوڵبژێر کردووە ، کەبریتین لەم فەرموودانەی لە خوارێ دەیانهێنم :

1. حەدیثێکی مەشهورە کە ئیمامی بوخاری بە ژمارە 3199 وە موسلیم بە ژمارە 159 ڕیوایەتی دەکەن کە دەمەو ئێوارەیەك رسول الله (صل الله عليه وسلم) بە (ابوذر الغفاري) دەفەرمووێت : (أتَدْرِي أيْنَ تَذْهَبُ ؟ قُلتُ : اللَّهُ ورَسولُهُ أعْلَمُ قالَ : فإنَّها تَذْهَبُ حتَّى تَسْجُدَ تَحْتَ العَرْشِ فَتَسْتَأْذِنَ، فيُؤْذَنُ لَهَا، ويُوشِكُ أنْ تَسْجُدَ فلا يُقْبَلَ منها، وتَسْتَأْذِنَ فلا يُؤْذَنَ لَهَا يُقَالُ لَهَا : ارْجِعِي مِن حَيْثُ جِئْتِ) واتە : (ئەی ابوذر دەزانیت ئەو خۆرە بۆ کوێ دەڕوات ، ابوذر دەڵێت : الله و ڕەسولەکەی دەزانن ، پێغەمبەریش دەفەرمووێت : دەڕوات لەژێر عەرش سوجدە بۆ الله دەبات و داوای ئیزنی لێ دەکات کە بگەڕێتەوە پاشان الله ئیزنی دەدات و دەفەرمووێت بگەڕێوە بۆ ئەو جێگەیەی لێی هاتوویت) ، شێوازی بەبەڵگەهێنانەوەی فەرموودەکە سەرەڕای ئەوەی زۆر ڕوونە :

1.فەرموودەکە زۆر بەڕوونی ڕووداوی خۆرئاوابوون و خۆر هەڵاتن دەداتە پاڵ خۆر .
2.زۆر زۆر زۆر بە ئاشکرا باس لەجوڵەی خۆر دەکات بەجۆرێک جوڵەکەی هۆکاری درووستبوونی شەو و ڕۆژە .
3.ئیمامی (ابن كثير) لە شیکردنەوەی ئەم فەرموودە لە کتێبی (البداية والنهاية) جوزئی یەک پەڕەی 32 ڕوونی دەکاتەوە کە مەبەستی حەدیثەکە ئەوەنیە کە خۆر سەرکەوێت بە ئاسمانەکاندا بڕواتە ژێر عەڕش بەڵکو تەواوی مەخلوقات لەژێر عەڕشن خۆر بڕواتە کوێ لەژێر عەڕشە ، کەدەڵێت : (ولا يدل على أنها تصعد إلى فوق السموات من جهتنا حتى تسجد تحت العرش بل هي تغرب عن أعيننا وهي مستمرة في فلكها الذي هي فيه وهو الرابع فيما قاله غير واحد من علماء التفسير)
واتە : (بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی ئاسمان بۆ ئاسمان سەرکەوێت بۆ ژێر عەڕش و سوجدەببات بەڵکو لەچاوانمان وون دەبێت کە ئاوادەبێت گەرنا لەسوڕانەوەی بەردەوامە لەخولگەکەی کە خولگەی چوارەمە و ئەم قسەیەش تەواوی زانایانی تەفسیر وتوویانە) جا لەم قسەی ابن كثير (رحمه الله) دوو خاڵی تری جەوهەریمان بەدەست هێنا کە بریتین لەم خاڵە : ابن كثيريش پێی وابووە خۆر دەسوڕێتەوە و لەخولگەی چوارەمە نەك زەوی ، وە دوای ئەمیش شێخ (ابن حجر العسقلاني) هەمان ڕەئی نەقڵ کردووە لە (فتح االباري) جوزئی 8 پەڕەی 419 و دەڵێت : (والحق أن الشمس في الفلك الرابع والسموات السبع عند أهل الشرع غير الأفلاك خلافاً لأهل الهيئة) واتە : (لەڕاستیدا خۆر لەخولگەی چوارەمە و ئاسمانیش حەوت چینە بێ لە خولگەگەکان ئەمەش زانایانی شەرع لەسەرین بەپێچەوانەی ئەوەی گەردووناسان دەیڵێن) مەبەستی شێخ ئەوەیە کە گەردووناسەکانی ئەوکات دەیانگووت حەوت خولگە هەیە نەك حەوت ئاسمان جا ئەویش دەڵێت نەخێر حەوت خولگە هەیە لە ئاسمانی یەکەم ڕەبتی نیە بە حەوت ئاسمانەکە وە خۆریش لەخولگەی چوارەمەوە ، جا ئەمەش کۆدەنگیە لەو دوو زانایە کە لەلای زانایان خۆر دەکەوێتە خولگەی چوارەم نە زەوی.
2.فەرموودەی دووەم ، ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی دەکات بەژمارە 3124 کە پێغەمبەری خوا باسی چیرۆکی غەزاکەی پێغەمبەر یوشەعمان بۆ دەکات (عليه سلام) سەرەتا بزانین یوشەع کێیە ، یوشەع کوڕی نون کوڕی ئەفرائیم کوڕی یوسف کوڕی یەعقوبە (سلام الله عليهم) یەکێکە لە نێردراوەکانی الله ، لەکاتێکا خەریکی غەزاکردنن ڕۆژی جومعە دەبێت ، لەشەریعەتی ئەواندا الله حەرامی کردووە کە داخڵی ڕۆژی شەممە بوون هیچ کار و کوشتارێک ئەنجام بدەن

، جا وا خەریکە خۆرئاوادەبێت ڕۆژی غەزاکە وە داخلی ڕۆژی شەممە دەبن و هێشتا تەواو نەبوون لە کۆکردنەوەی غەنیمەت و دەستکەوتەکان ، جا پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت لەو کاتەدا یوشەع سەری بەرز دەکاتەوە و دەڵێت : (یا الشمس إنك مأمورة وأنا مأمور اللهم احبسها علينا فحبس الله الشمس عليهم).واتە : (ئەی خۆر من نێردراوم تۆش هەروەها ، یا اللە خۆر بووەستێنە ، اللەش خۆری بۆی وەستاند) ، ئەریٚ لەمە ڕوونتر هەیە ؟ بۆ ئەوەی خۆر ئاوانەبێت داوای کرد خۆر بوەستێت لە اللە ، پێغەمبەر دەفەرمووێت اللەش خۆری بۆی وەستاند ، تۆ بڵێیت زەوی دەجوڵێت و هۆکاری درووستبوونی شەو و ڕۆژ جوڵەی زەوییە ئەم کوفر و بەدرۆ خستنەوەی قورئان و ئەم حەدیثە سەریحەنیە ؟

ئێستاش لەدوای هێنانەوەی بەڵگە لە قورئان و سوننەت دەڕۆینەوە لای قسەی زانایان بزانین چیان لەم بارەیەوە وتووە .

## ووتەی زانایان لەسەرجێگیری زەوی

بێگومان کۆمەڵێک لەزانایانی خەلەف لە کتێبەکانیاندا ئاماژەیان بەو باسە داوە پاش ئەوەی بیرۆکەی ئەوە پەیدابوو کە زەوی دەجوڵێت ، لەناویاندا شێخ (عبدالقاهر بن طاهر البغدادي) کە لەساڵی (369 ه) لەدایکبووە لە کتێبی (الفرق بين الفرق) پەڕەی 285 پاش گێڕانەوەی کۆمەڵێک لەو بابەتانەی اهلی سوننە کۆدەنگییان لەسەری هەیە دێتە سەر ئەم باسە و دەڵێت : (واجمعوا بوقوف الارض وسكونها وان حركاتها انما تكون بعارض يعرض لها من زلزلة ونحوه) واتە : (وە کۆدەنگین لەسەر ئەوەی کە زەوی وەستاو و جێگیرە و ئەگەریش جوڵا یان بەهۆی بوومەلەرزەیە یان هاوشێوەی بوومەلەرزە) هەروەها گەورە موفەسسیر ئیمامی (القرطبي) لە تەفسیرەکەی بەناوی (جامع الاحكام القرآن) لەتەفسیری ئایەتی 2 ی سورەتی (الرعد) دەڵێت : (وَالَّذِي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ وَأَهْلُ الْكِتَابِ الْقَوْلُ بِوُقُوفِ الْأَرْضِ وَسُكُونِهَا وَمَدِّهَا وَأَنَّ حَرَكَتَهَا إِنَّمَا تَكُونُ فِي الْعَادَةِ بِزَلْزَلَةٍ تُصِيبُهَا) واتە : (ئەوەی مسوڵمان و اهلی کتاب لەسەرین ئەوەیە کە زەوی وەستاو و جێگیرە وە جوڵەکەیشی عادەتەن بەهۆی بوومەلەرزەوە تووشی دەبێت) ،

وە لەناو زانایانی سەردەمیش ئەم زانایانە قسەیان لەم بارەیەوە کردووە :

1.شێخ (محمد بن ابراهيم) ڕەحمەتی اللەی لێبێت لە (مجموع الرسائل) جوزئی 13 پەڕەی 107 دەڵێت : (الذي يقول إن الشمس لا تجري كافر كفره ينقل عن الملة لمخالفته

القرآن ودوران الارض قول باطل لمخالفته النصوص القرآنية والقائلون به ليس لهم حجة عقليا أصلا كما أنه ليس معهم حجة سمعية أبدا) واته : (ئەوەی دەڵێت خۆر ناڕوات کافرە و کوفرەکەیشی لەدین بردوویەتیە دەرێ وە ئەوانەشی دەڵێن زەوی دەسووڕێتەوە قسەکەیان بەتاڵە چونکە پێچەوانەی قورئانە و هیچ بەڵگەیەکی عەقڵی و سەمعییان پێنیە) .

2. شێخ (عبدالله الدويش) لە کتێبی (مورد الزلال) پەڕەی 171 دەڵێت : (القول بأن الارض مدار حول الشمس كلام باطل من وجهين ، الاول الارض ليست لها مدار لانها ثابتة كما دل عليه القرآن والسنة واالاجماع ، و الشمس تجري وتمر على جميع الارض) واتە : (ئەو ووتەیە کە گوایە زەوی خولگەی هەیە بەدەوری خۆردا ووتەیەکی بەتاڵە لەدوو ڕووەوە چونکە زەوی جێگیرە خولگەی نیە بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و اجماع وە خۆریش بەسەر زەویدا دەسووڕێتەوە) .

3. شێخ (حمود التويجري) کە کتێبی تێر و تەسەل و جوان و گەورەی تەرخان کردووە بەم باسە بەناوی (صواعق شديدة لاتباع هيئة جديدة) لەپەڕەی 8 دەڵێت : (ذهب كبير الفلاسفة ومقدمهم بطليموس وكان زمانه قبل المسيح بنحو مائة وخمسين سنة الى ان الارض هي المركز الثابت والشمس والقمر وسائر الكواكب تدور على الارض ، واهل الهيئة القديمة يقول بهذا القول وهو الحق الذي تدل عليه الآيات والاحاديث الصحيحة واقوال المفسرين من الصحابة و التابعين وائمة العلم والهدي من بعدهم) واتە : (گەورە فەیلەسووفەکان و لەپێشینیان بەتڵیمۆس کە سەد و پەنجا ساڵ پێش مەسیح هەبووە پێیان وابووە زەوی سەنتەرە و جێگیرە و خۆر و مانگ و هەسارەکان بەسەر زەویدا دەسووڕێنەوە وە گەردووناسە کۆنەکان لەسەر ئەم ڕایە بوون وە قورئان و سوننەت و ووتەی موفەسسیرین و اصحاب و تابعين و زانایانیش لەسەر ئەمەیە) شێخ (حمود) بەم قسەیە درێژە دەدات بە باسەکە و بەڵگەکان دەخاتە ڕوو و بە 192 پەڕە کۆتایی دێنێت بە کتێبەکەی .

4. شێخ (عبدالعزيز بن باز) لە نامیلکەیەکیدا کە دایناوە تایبەت بەم باسە بەناوی (ادلة نقلية و حسية على جريان الشمس) لەپەڕەی 21 دەڵێت : (فلقد شاع بين كثير من الكتاب والمولفين والمدرسين في هذا العصر ان الارض تدور والشمس ثابتة وفي هذه مسالة أقول قد دل عليه القرآن الكريم و الاحاديث النبوية والاجماع العلماء والواقع شاهد على ان الشمس جارية في فلكها كما سخرها الله والارض ثابتة)

واتە : (وا بڵاوە لە زۆرێک لە کتێب و نوسراوەکان و لای وانەبێژان کە زەوی دەسووڕێتەوە و خۆر وەستاوە منیش لەم باسەدا دەڵێم ئەوەی بەڵگەی قورئان و سوننەت و کۆدەنگی زانایانی لەسەرە و واقع پیشانی دەدات خۆر دەسووڕێتەوە و زەویش وەستاوە) .
5.شێخ (محمد بن صالح العثيمين) لە (مجموع فتاوى) جوزئی یەك پەڕەی 72 دەڵێت : (أقول لمن أسند إليه تدريس مادة الجغرافية بين للطلبة أن القرآن الكريم والسنة يدل على ان تعاقب اليل والنهار يكون بدوران الشمس على الارض لا بالعكس) واتە : (دەڵێم بەو کەسانەی وانەبێژی وانەی جوگرافیان کە بۆ خوێندکارانی ڕوون بکەنەوە گۆڕانی شەو و ڕۆژ بەهۆی سوڕانی خۆرە بەسەر زەوی نەک پێچەوانەکەی) .

## وەڵامی گوومانەکان لەسەر جێگیری زەوی

ئەو کەمینە کەسەی کە پشتگیری ئەو قسە بەتاڵە دەکەن گوایە زەوی دەسووڕێتەوە بەدەوری خۆردا وە جوڵەی هەیە ، پەنا دەبەنە بەر درووستکردنی هەنێک شوبهەی بەتاڵ و بێمانا و استدلالکردنێکی بەتاڵ بە کۆمەڵێک ئایاتی خوای پەروەردگار ، دەبینین هەنێک دەڵێن ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زەوی دەجووڵێت : (وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ) کە سورەتی (النمل) ئایەتی 88 ە ، واتای ئایەتەکە : (وە کێوەکان دەبینیت واهەست دەکەیت وەستاون لەکاتێکا وەک هەور دەجوڵێن) گوایە کێوەکان بجوڵێن واتە زەوی دەجوڵێت ، جا ئێمەش بەم چەند خاڵە وەڵام دەدەینەوە :
1.ئەو هەموو بەڵگە قورئانی و سوننەتیە خاشاحەڵنەگرە و کۆدەنگی و ووتەی زانایانمان هێنایەوە کەچی تۆ پەنا بۆ ئەم تەئویلە بەتاڵە دەبەیت کە الف وبێ زمانی عەرەبی نازانیت یانی ئەو زانایانە ئەو ئایەتەیان نەبینی ؟
2.ئەوەی الفێک لەزمانی عەرەبی بزانێت دەبینێت فعلی (ترى) واتە (بینین) لەئایەتەکەدا حەرفی (واو العطف) لەپێشیەوە هاتووە دەفەرموویت : (وترى) هەر کارێکیش (واو العطف) بکەوێتە بەردەمی ئەوا کارەکە دەبەستێتەوە بە جوملەی پێش خۆی ، جا با سێری ئایەتێک پێش خۆی بکەین واتە 87 الله سبحانه وتعلى دەفەرموویت : (وَيَوْمَ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ ....) واتە : (کە کاتێک فوو کرا بە نەفخی سوڕدا) کەوایە ئایەتەکە باسی قیامەتە کە کێوەکان دەڕۆن نەک ئێستا وەک لەچەند ئایەتێکی تریشدا باسی جوڵەی کێوەکان دەکات لە قیامەت وەک لە سورەتی (التكوير) ئایەتی 3 دەفەرموویت : (وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ) واتە : (وە کاتێک کێوەکان

دەرۆن) کە سورەتی (التكوير) باسی قیامەت دەکات ، وە ئایەتی 47 ی سورەتی کەهف دەفەرموویت : (وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا) واتە : (وە رۆژێک کە کێوەکان دەرۆن و قەراغی زەوی دەبینرێت و حەشردەکرێن و کەس غەدری لێ ناکرێت) ، وە پرسیار لە شێخ ابن عثیمین دەکەن لە زنجیرەی (فتاوای نور علی درب) لە شریتی 90 سەبارەت بەم ئایەتە ئەویش دەڵێت : (فهذه الآية في يوم القيامة لان الله ذكرها بعد ذكر النفخ في الصور فالآية هذه في يوم القيامة بدليل ما قبلها وما بعدها وليست في الدنيا) واتە : (ئەم ئایەتە رۆژی قیامەتە بەبەڵگەی ئەوەی الله لەدوای باسکردنی نەفخی سور باسی کردووە و ئایەتەکە قیامەتە نەک ئەم دوونیا) .

## ئایا زەوی تەختە یاخود گۆییە لەتێرو انینی دەقە شەرعیەکان

لێرە بەدواوە باسەکە دەگۆرێت ، تا ئێستا باس لە جوڵەی زەوی بوو ، بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و کۆدەنگی زانایان سەلماندمان زەوی وەستاو و جێگیرە وە سورانەوەی خۆر هۆکاری درووست بوونی شەو و رۆژە ، لێرەوە باس لەو بابەتە دەکەین کە جێگەی مشتومرە زیاتر کە شێوەی زەوییە ئایا تەختە یان گۆییە ، سەرەتا هەردوو مۆدێلەکە دەناسێنم :

1.مۆدێلی زەوی گۆیی (Spherical Earth .كروية الارض) : ئەم مۆدێلە لە زەوی سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەرێتەوە بۆ سەدەی پێنجەمی پێش زایین و لەناو ئەغریقیەکان سەری هەڵدا و دەگووترێت (فیساگۆرس) یەکەم کەس بوو ئەم مۆدێلەی خستە روو ئەویش پێی وابوو ئەو تاریکیەی دەکەوێتە سەر رووی مانگ بریتیە لەسێبەری زەوی ، وە چەندین بەبەڵگەهێنانەوەیان ئەنجامدا ، لەوانەش (ئەناکساگۆراس) پێی وابوو خۆرگیران و مانگیران بەهۆی سێبەری زەوییەوەیە و ئەگەریش بروانی سێبەرەکە چەماوەیە کەوایە زەوی شێوەی گۆییە ، وە (ئەرستۆ) پێی وابوو ئەستێرەکان بەڵگەن لەسەر گۆییەتی زەوی چونکە بەنموونە ئەستێرەکانی باکوور ئەگەر کەسێک لەباکوور بێت ئەوا بەسەر سەرییەوە بە ستوونی دەیبینێت بەڵام کەسێک وردە وردە لەباکوور دوور بکەوێتەوە ئەوا بەچەماوەیی دەیبێنێت و وردە وردە لەئاسۆی بینین دادەبەزێ ، وە هەروەها ون بوونی کەشتی لەدەریا وەک بەڵگە دەهێننەوە بۆ چەمانەوەی زەوی ، ئەم مۆدێلەش بە دوو شێوە بڵاو بۆیەوە ، سەرەتا بە

شێوازی (جیۆسنتریك) وەک باسمان کرد پێی وابوو زەوی سیستمێکی سەربەخۆیە و سەنتەری سیستمەکەیە و خۆر و مانگ و هەسارەکان بەدەوریدا خولگەیان هەیە ، پاشان شێوازی (هێلیۆسنتریك) هات پێی وابوو هەمان ئەو سیستمەی سەرەتا بوونی هەیە بەڵام خۆر سەنتەرە نەك زەوی ، وە ئەم شێوازەی دووەم تا ئێستاش بەردەوامە و وەك زانستێکی سەلمێنراو تەماشای دەکەن .

2.زەوی تەخت (Flat Earth . الارض المسطحة) : ئەم مۆدێلەش لەناو کۆمەڵگا و نەتەوە زۆر کۆنەکانی پێش بڵاوبوونەوەی مۆدێلی زەوی گۆیی بوونی هەبووە وە دەتوانین بڵێین پێش بڵاوبوونەوەی مۆدێلی گۆیی بوونی زەوی لای ئەغریقیەکان تەواوی شارستانیەتە کۆنەکان پێیان وابووە زەوی تەختە و خۆر و مانگیش بچوکن بەسەریدا دێن و دەڕۆن و شەو و ڕۆژ درووست دەبن ، جا ئەم مۆدێلە کە ئەوەی باوە ئێستا و دەگووترێت بەم شێوازەیە : زەوی تەختانیەکی فراوانە کۆتاییەکەی نەزانراوە وە ئاسمانیش بەسەر زەوییەوە نەک بەدەوریدا چونکە زەوی زەوییە و ئاسمان ئاسمانە ، زەوی لەئاسماندا نیە و زەوی نزماییە و ئاسمان بەرزاییە ، وە تەواوی هەسارە و ئەستێرە و خۆر و مانگ بەسەر زەویدا بەشێوەی بازنەیی دێن و دەچن و شێوەی زەوی تا ئەوەی زانراوە بەشێوەی بازنەیی دەورە دراوە بە بەستەڵەکی ئەنتارتیکا و لەپاشان نازانرێت چی بوونی هەیە و خۆر بەشێوازی بازنەیی بەسەر زەویدا دەسووڕێتەوە لەهەر شوێنێک بدات دەبێتە ڕۆژ لەو شوێنەش بڕوات دەبێتە شەو وە بەپێی بەرز و نزمی خولگەکانی وەرزەکان درووست دەبێت ، جا ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەوەی تێبگەیت لەمۆدێلەکە نەوەك زەوی تەختت هاتە بەرگوێ پێت وابێ وەك پارچە فلسێک وایە لە بۆشایی ئاسمان و بیرکەیتەوە ئاو لەلێوارەکانی بڕژێتە خوارێ و دنیا بەجارێک شەو یان ڕۆژ بێت ، وە سەبارەت بەم زانیارییانە ان شاءالله لەکتێبێکی تەرخان کراو بەم باسە بەشێوەی زانستی و مێژوویی باسیان لێوەدەکەین ، بەڵام ئەوەی گرنگە قسە لەو بارەیەوە بکەین ئایا دەقە شەرعیەکان لەگەڵ کام بیرۆکەیەدان ، کام لەو دوانە حەقیقەتن ، جا سەرەتا دەڕوانینە دەقەکانی قورئان بەناوی خوای پەروەردگار ، الله سبحانە وتعلى لە سورەتی (البقرة) ئایەتی 22 دەفەرموویێت : (الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً) واتە : (ئەو زاتەیە زەوی بۆ

کردوون بە فەرش و ئاسمانیشی ڕاگیرکردووە) وە لەسورەتی (النوح) ئایەتی 19 دەفەرمووێت : (وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا) واتە : (الله زەوی بۆ ئێوە کردووە بە ڕاخەر) وە لەسورەتی (الذاريات) ئایەتی 48 دەفەرموویت : (وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ) واتە : (وە زەویشمان ڕاخستووە جا ڕاخەرێکین ئێمە) وە لەسورەتی (الرعد) ئایەتی 2 دەفەرموویت : (وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ) واتە : (ئەو زاتەیە زەوی پان و پۆڕ کردوون) وە لەسورەتی (الحجر) ئایەتی 19 و سورەتی (ق) ئایەتی 7 دەفەرموویت : (وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا) واتە : (وە زەویمان پان و پۆڕ کردووە) وە لە سورەتی (الغاشية) ئایەتی 20 دەفەرمووێت : (وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ) واتە : (وە بۆ ناڕواننە زەوی چۆن تەخت کراوە) وە سورەتی (النازعات) ئایەتی 30 : (وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا) واتە : (وە زەویشمان لەپاشاندا ڕاخست) وە لەسورەتی (الشمس) ئایەتی 6 : (وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا) واتە : (وە سوێند بەزەوی و ئەوەی ڕایخستووە) ، جا لەم ئایەتانەی هێنامانەوە ئەم الفاظانە بۆ زەوی بەکارهاتووە : (فراشا ، بساطا ، فرشناها ، مد ، مددناها ، سطحت ، دحاها ، طحاها) هەموویان بەواتای (تەخت و ڕاخراو و پانکراو) دێت ، تاکە لەفظێکی تێدانیە ماناکەی نزیک بێت لەوەی کە شێوەی زەوی گۆیی بێت ، جا چەند خاڵێک سەبارەت بەم ئایەتانە دەخەمە ڕوو بۆ ئێوەی بەڕێــز :

1. ئەو بەڕێزانەی دەڵێن ئەم ئایەتانە بەواتای ئەوە دێت کە لەچاو و بینینی ئێمە ڕاخراو و تەختە ئەگینا گۆییە ، دەپرسم ئایا بە چ پێوەرێک ئەم تەئویلانەت بۆ ئەم ئایەتانە کرد و پشتت بەچی بەستووە ؟
2. گەر دەڵێن ئەی تۆ چۆن ئەم ئایەتانە ئەکەیتە بەڵگە ، ئێ والله ئایەتەکانمان وەک خۆی وەرگرتووە ئەڵێ زەوی ڕاخراوە منیش ئەڵێم ڕاخراوە تۆ دێیت دەڵێی ڕاخراوە بەس گۆییە ئەبێت تۆ بەڵگە بێنیت لەسەر قسەکەت .
3. ئەوانەی دەڵێن ئەم ئایەتانە بەڵگەنین لەسەر تەختی زەوی ، باشە ئەتەوێت الله لەوە زیاتر چی بڵێت ئنجا ئەڵێی گۆییە ؟ لەوە ڕوونتر هیچ لەفظێک شک ئەبەیت ؟
4. قورئانێک الله جل جلالە چەندین جار وەسفی کردووە بەڕوونی و ڕەوانی و پاراوی ، لە هەشت بۆ نۆ ئایەت بڵێ زەوی ڕاخراو و پان و پۆڕ و تەختە کەچی گۆیی بێت ؟

5. ئایا بۆچی الله لەهیچ لەو ئایەتانە ئاماژەی نەداوە بڵێ مەبەستم بینینی ئێوەیە .

6. مرۆڤێک لەسەر مانگ ئەو ئایەتانە بخوێنێتەوە ئایا ئەمە زەوی لەپێش چاوی ئەو تەخت و ڕاخراوە هەر ؟

7. هەشت ئایەت دەڵێت ڕاخراو و تەختە ، یەک ئایەت بێنە بڵێ گۆییە و با ئێمەش بڵێین مەبەستی ئەم ئایەتانە بینینی ئێمەیە .

8. ئەو الفاظانە گشتی باسی ڕاخستن دەکات ، ئایا ڕاخستن بەسەر شتی تەختدا دەبێت یان گۆیی ؟ ئایا فەرش کە الله دەفەرمووێت زەوی فەرشە ئایا بەسەر تەختیدا ڕادەخرێت یان بەسەر شتی گۆیی ؟ نەخێر شتی گۆیی شتی بەسەردا ڕاناخرێت بەڵکو تێوەی دەپێچرێت .

9. ئایەتی (وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ) زۆرن ئەوانەی دەڵێن ئەم ئایەتە مەبەستی لەبینینی ئێمەیە ، ئەم ئایەتەی سورەتی (الغاشية) سێ ئایەتی دیکە لەپێشیەوە هاتووە پەیوەستن پێکەوە کە دەفەرمووێت : (أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ .وَإِلَى السَّمَاء كَيْفَ رُفِعَتْ .وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ .وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ) واتە : (ئایا تێڕانامێنن الله چۆن حوشتری درووست کردووە و ئاسمانی بەرزکردۆتەوە و کێوەکانی داکوتیووە و زەوی تەخت کردووە) ، ئێ باشە ئەگەر بڵێی تەخت کردنەکەی لەچاوی ئێمەدا کردووە لەبینینی ئێمەدا تەختە ئەگینا تەخت نیە ئەوا کەوایە حوشتریشی بەس لەچاو و بینینی ئێمەدا درووست کردووە ئەگینا درووستکراو نیە وە ئاسمانیشی لە بینینی ئێمەدا بەرزکردۆتەوە ئەگینا بەرز نیە وە کێوەکانیشی لەبینینی ئێمەدا داکوتیووە ئەگینا داکووتراو نیە ،

چونکە دەبێت ئایەتەکان هەمان مانا هەڵگرن لەبەر ئەوەی (واو العطف) پێکیانەوە ئەبەستێتەوە و گشتیان بەیەکەوە وابەستن و لەحوکمدا وەك یەك وەهان ، جا لەسەر تەفسیری ئەم ئایەتە ئیمامی (البغوي) لە تەفسیرەکەی خۆی لەسەر ئەم ئایەتە ڕیواتێك دێنێت لە (ابن عباس) ڕەزاو ڕەحمەتی اللەی لێبێت لەسەر ئایەتەکە فەرموویەتی : (هل يقدر أحد أن يسطح الارض مثله) واتە : (ئایا کەس هەیە وەك الله زەوی تەخت بکات) واتە وەك تەحەددایەك ، دەی ئەگەر بڵێی مەبەستی ئایەتەکە ئەو پارچە زەوییەیە کە ئێمە دەیبینین ئەوا لەوەڵامی ابن عباس دەڵێین بەڵێ ئەی بۆ کەس نیە ئەروەڵا بە عادیلە تەختی دەکەم جوان

جوان ڕێک و پاك و ساف ئەکەم بەتەواوی ، جا تاوەکو دوای ئەم هەموو بەڵگەیە نەڵێن لەخۆتانەوە شیکردنەوە بۆ ئایەتەکان دەکەن ئەوا بڕیارم دا قسەی کۆمەڵێکی زۆر لەزانایان و اهلی تەفسیر کۆ بکەمەوە لەسەر ئایەتەکان و بیخەمە ڕوو ، لەوانە بریتین لە

1. ابن عطية الاندلسي (486 کۆچی) یەکێک لە موفەسسیرە گەورەکانی قورئان ، لە کتێبەکەی (المحرر الوجيز) جوزئی پێنج پەڕەی 475 لەتەفسیری ئایەتی 20 ی سورەتی (الغاشية) دەڵێت : (وظاهر هذه الآية (وإلى الارض كيف سطحت) أن الارض سطح لا كرة وهو الذي عليه أهل العلم والقول بكرويتها لا ينقص ركنا من أركان الشرع وهو قول لا يثبته علماء الشرع) واتە : (وە واتای ئەو ئایەتە ئەخوازێت زەوی تەخت بێت نەك گۆیی وە اهلی علم لەسەر ئەمەبوون وە بشڵێیت گۆییە هیچ کەموکوڕییەک لە ڕووکنەکانی شەرع درووست ناکات بەڵام ئەمە قسەیەکە زانایانی شەرع نەیانسەلماندووە) .

2. عبدالرحمن بن محمد الثعالبي (786 کۆچی) یەکێکی دیکە لە موفەسسیرین ، لەتەفسیری هەمان ئایەت لەکتێبی (جواهر الحسان) جوزئی 8 پەڕەی 583 نەفسی قسەی ابن عطية نەقڵ دەکات بۆمان بەبێ دەستکاری و دەڵێت : (وظاهر الآية أن الارض سطح لا كرة وهو الذي عليه أهل العلم والقول بكرويتها لا ينقص ركنا من أركان الشرع وهو قول لا يثبته علماء الشرع)

واتە نەفسی قسە و نەفسی کۆدەنگی نەقڵ دەکات دوای سێ سەدە کە اهلی علم اثباتی تەختبوونی زەوییان کردووە .

3. جلال الدين بن احمد المحلي (791 کۆچی) خاوەنی یەکێک لەبەهێزترین تەفسیرەکان بەناوی تەفسیری (الجلالين) لەهەمان کتێب و تەفسیری هەمان ئایەت (کە دەکاتە پەڕەی 805) دەڵێت : (وإلى الارض كيف سطحت ،أي بسطت ، وظاهر فيه الارض سطح كما عليه علماء الشرع لا كرة كما قال أهل هيئة) واتە : (والى الارض كيف سطحت ، یانی ڕایخستووە ، وە خواستراو تێیدا ئەوەیە زەوی تەختە و زانایانی شەرع لەسەر ئەمەبوون ، وە گۆیی نیە وتك ئەوەی گەردوونناسان دەیڵێن) ، لێرەش بەهەمان شێوەی ابن عطية و الثعالبي (رحمهم الله) شێخ جلال الدين المحلي ئەو ڕەئییە دەداتە پاڵ علمائی شەرع و تەفسیری ئایەتەکە دەکات

بەوەی زەوی تەختە بەپێی ئەو ئایەتە نەک گۆیی .
4. عصام الدین بن محمد القونوي (1195 کۆچی) یەکێکە لەو زانایانەی حاشیەی تەفسیری (البیضاوي) نوسیووە بەشێوازێکی زۆر ورد و درشت و دوورو درێژ لە 20 جوزئدا ، جا لە حاشیەکەی لە جوزئی 20 پەڕەی 239 لەسەر هەمان ئایەتی پێشوو دەڵێت : (وإلى الارض کیف سطحت ، فیه دلیل على أن الارض مسطحة غیر کرویة کما ذهب إلیه أهل الشرع ومن ذهب إلى کرویته یأول بأن لعظمتها ترى بالمسطحة) واتە : (والى الارض کیف سطحت ، بەڵگەی تێدایە کە زەوی تەختە نەك گۆیی وەك چۆن ئەهلی شەرع لەسەر ئەمەبوون ئەوەیشی پێی وایە گۆییە پێی وایە لەگەورەییدا بە تەختی دەیبینین و بەو شێوەیە تەئویلی دەکات) ئەمەش چوارەم زانا و چوارەم سەرچاوە کە لێکدانەوەی بۆ ئایەتەکە کرد کە بەواتای ئەوە دێت زەوی تەختە و ئەم قسەیەی دایە پاڵ اهلی شەرع .
5. شهاب الدین بن احمد الخفاجي (976 کۆچی) لە تەفسیری هەمان ئایەتی پێشوو لەکتێبی (عنایة القاضي وکفایة الراضي) جوزئی 9 پەڕەی 479 دەڵێت : (وإلى األرض کیف سطحت أي بسطت وعلى هذا ینفي کرویتها کما علیه أهل الشرع) واتە : (والى الارض کیف سطحت ، واتە ڕایخستووە و بەمە بێت نەفی گۆیی بوونی دەکات وەك چۆن اهلی شەرع لەسەر ئەمەبوون) ئەمە پێنجەم زانا ڕەئی (تەخت بوونی زەوی و ڕەدکردنەوەی گۆیی بوونی) بداتە پاڵ زانایان و اهلی شەرع و ئەو ئایەتە بکاتە بەڵگە بۆ تەخت بوونی زەوی
ووتەی ئەم پێنج زانایە (ابن عطیة ، الثعالبي ، جلال الدین المحلي ، القونوي ، الخفاجي) تەنها بۆ تەفسیری ئەو ئایەتە هێنامەوە ، گەرنا چەندان زانای تر قسەیان لەم بارەیەوە کردووت لەوانەش :
1. عبدالقاهر بن طاهر البغدادي (369 کۆچی) مامۆستای ئیمامی (البیهقي) محدث ، سەرەتا کۆدەنگیەکەی ئەو گێڕاویەتییەوە لەسەر ئەوەی زەوی وەستاوە باسمان کرد لە کتێبی (الفرق بین الفرق) پەڕەی 287 کۆدەنگی زانایان دەهێنێت لەسەر ئەوەی زەوی تەختە و دەڵێت :
(وأجمعوا على أن الارض متناهیة الاطراف من جهات کلها وأجمعوا على أن السموات سبع سموات طباقا وأنه لیست بکریة) واتە : (وە کۆدەنگین لەسەر ئەوەی زەوی لەهەموو

لایەکانەوە کۆتایی پێدێت وە کۆدەنگین لەسەر ئەوەی ئاسمان حەوت چینە و گۆییش نیە)

2. هەروەها یەکێک لەو زانا بەڕێزانەی سەدەی سێیەمی کۆچی کە خاوەنی نوونییەیەکە کە تێیدا بەشێوازی هۆنراوە بیروباوەڕی اهلی سوننە و جەماعە دەخاتە ڕوو زۆر بەجوانی ، ئەویش ئیمامی (القحطاني) ە کە لە بەیتێکدا دەکەوێتە پەڕەی 28 دەڵێت :

**كذب المهندس والمنجم مثله**

**فهما لعلم الله مدعيان**

**الارض عند كليهما كروية**

**وهما بهذا القول مقترنان**

**والارض عند اولي النهى لسطيحة**

**بدليل صدق واضح القرآن**

واتە : ئەندازیار و ئەستێرەناسەکان درۆیان کرد کاتێک بانگەشەی زانستێکیان کرد کە هی اللەیە ، بەوەی وتیان زەوی گۆییە و کۆک بوون لەسەرئەم قسە ، زەوی تەختە لای خاوەن هۆش و کەسە ژیرەکان بە بەڵگەی ڕوونی قورئان .

3. ابو الحسن الماوردي (364 کۆچی) یەکێکە لە موفەسسیرە گەورەکانی ئوممەت ، خاوەنی کتێبی گەورەی فەتوا بەناوی (الحاوي) لە کتێبی (النكت والعيون) جوزئی 3 پەڕەی 93 تەفسیری ئایەتی (وهو الذي مد الارض) دەکات و دەڵێت : (أي بسطها ردا لمن زعم أنها مستديرة كالكرة) واتە : ئایەتەکە یانی ڕایخستووە زەوی ، وەك ڕەددێک بۆ ئەوەی پێی وایە خڕە وەك تۆپ) .

4. علاء الدين ابن خازن البغدادي (678 کۆچی) لە کتێبە گەورەکەی بۆ تەفسیری قورئان بەناوی (لباب التأويل) جوزئی 3 پەڕەی چوار لەتەفسیری هەمان ئایەتی پێشوو کە ئیمامی (الماوردي) تەفسیری کرد دەڵێت : (قال أهل هيئة إن الارض كرة مع ذلك أخبر الله تعلى أن مد الارض ودحاها وبسطها وكل ذلك يدل على تسطيح الارض والله تعلى أصدق قيلا من أصحاب هيئة) واتە : (گەردوونناسان دەڵێن زەوی گۆییە لەکاتێکا اللە هەواڵیمداوە زەوی پان کردووە وە ڕایخستووە ئەمانەش بەڵگەن لەسەر تەختی زەوی وە قسەی اللە ڕاسترە لەهی گەردوونناسان)

.

5.يوسف بن حيان الاندلسي (654 كۆچی) كه خاوەنی كتێبی (البحر المحيط) ه كه لای زانایان بەهێزترین تەفسیرە كە بەشێوازێكی (النحو) ی تەفسیری ئایەتەكانی كردبێ ، لەو كتێبە لە جوزئی 8 پەڕەی 334 تەفسیری ئایەتی (والله جعل لكم الارض بساطا) دەڵێت : (وظاهره أن الارض مبسوطة

ليست كروية) واتە : (لەئایەتەكە ڕادیارە زەوی تەخت بێت و گۆیی نەبێت) .

6.محمد بن جزي الغرناطي (693 كۆچی) لە كتێبی (التسهيل للعلوم التنزيل) جوزئی 1 پەڕەی 531 لەتەفسیری ئایەتی (وهو الذي مد الارض) دەڵێت : (يقتضي أن الارض بسيطة غير مكورة وهو ظاهر الشريعة) واتە : (ئایەتەكە یەكلایی دەكاتەوە زەوی تەخت بێت نەك گۆیی وە ئەمەش خوازراوی شەریعەتە) .

7.زانای گەورەی ئوممەت و خاوەنی یەكێك لەبەهێزترینی تەفسیرەكان ئیمامی (القرطبي) كە لەساڵی (610 كۆچی) لەدایكبووە ، لە كتێبی تەفسیرەكەی (جامع الاحكام) جوزئی 7 پەڕەی 2 تەفسیری هەمان ئایەتی پێشوو دەكات و دەڵێت : (وفيه رد لمن زعم أن الارض كالكرة) واتە : (ئەم ئایەتە ڕەددی تێدایە بۆ ئەوانەی پێیان وایە زەوی وەك تۆپە) پاشان لەسەر هەمان ئایەت باس لەوە دەكات مسوڵمانان و اهلی كتاب پێیان وایە زەوی وەستاوو جێگیرە وەك لەپێشوودا باسمان كرد .

8.یەكێكی دیكە لەزانایانی اهلی سوننە ئیمامی (ابوالقاسم برهان الدين الكرماني) كەلەساڵی (505 كۆچی) لەدایكبووە لە كتێبی (الاكليل في استنباط التنزيل) پەڕەی 198 تەفسیری ئایەتی (والارض مددناها) دەكات و دەڵێت : (فيه دليل على أن الارض مبسوطة غير كرة) واتە : (بەڵگەی تێدایە زەوی تەختە نەك گۆیی)

9.جلال الدين بن عبدالرحمن السيوطي (849 كۆچی) لەكتێبی (عقود الجمان في معاني والبيان) پەڕەی 21 دەڵێت : (وقد قالوا أهل هيئة أن الارض كرة لا سطح ولكن نزل القرآن بأن الارض سطح قال تعلى : وإلى الارض كيف سطحت) واتە : (گەردووناسان دەڵێن زەوی گۆییە و تەخت نیە بەڵام قورئان دایبەزاندووە كە زەوی تەختە ئەوەتا دەفەرمووێت : بڕواننە زەوی

چۆن تەخت کراوە)

10.محمد بن علي الشوكاني (1173 کۆچی) یەکێکە لەدیارترین زاناکانی اهلی سوننە و اهلی یەمەن ، خاوەنی گەورە کتێبی (فتح الرباني) لە کتێبی تەفسیرەکەی بەناوی (فتح القدير) پەڕەی 758 لەتەفسیری ئایەتی (والارض مددناها) دەڵێت : (أي بسطناها وفرشناها كما في قوله

(والارض بعد ذلك دحاها) وقوله (والارض فرشناها) وفيه رد لمن زعم أن الارض كالكرة) واتە : (واتای ئایەتەکە ئەوەی زەوی پان کردووە و ڕایخستووە وەك چۆن لەئایەتێکی تر دەفەرمووێت (والارض بعد ذلك دحاها) وە (والارض فرشناها) وە تێیدا ڕەدد هەیە بۆ ئەوەی پێی وایە زەوی گۆییە) .

11.محمد صديق حسن القنوجي (1248 کۆچی) کەناسراوە بە (قاضي هند) لە کتێبی (فتح البيان) جوزئی 1 پەڕەی 22 لەتەفسیری ئایەتی (الذي جعل لكم الارض فراشا) دەڵێت :

(إستدل به أكثر المفسرين بأن الارض بسيطة ليست بكروية)

واتە : (زۆرینەی موفەسسیرین بەبەڵگە ئەم ئایەتەیان هێناوە کە زەوی تەخت و ڕاخراوە نەك گۆیی)

12.نجم الدين ابن احمد الغيطي (984 کۆچی) لەکتێبی (الاجوبة مفيدة عن الاسئلة عديدة) پەڕەی 74 دەڵێت : (الذي ذهب إليه عامة المفسرين من الكتاب العزيز أن السماء مسطوحة غير كرة وكذلك الارض مسطوحة غير كرة قال

العلامة جلال الدين بن أحمد المحلي في قوله تعلى (والى الارض كيف سطحت) ظاهر فيه أن الارض سطح لا كرة كما عليه علماء الشرع) واتە : (ئەوەی بە گشتی موفەسسیرانی قورئانی پیرۆز لەسەرین ئەوەیە ئاسمان و زەوی تەختن نەك گۆیی وە عەللامە جلال الدين بن احمد المحلي سەبارەت بە ئایەتی (والى الارض كيف سطحت) دەڵێت وا ئەخوازێ زەوی تەخت بێت نەك گۆیی و زانایانی شەرعیش لەسەر ئەمەن)

13.مرعي بن يوسف الحنبلي (1033 کۆچی) لەکتێبی (بهجة الناظرين وآيات مستدلين) بەشێکی کتێبەکەی داناوە بۆ قسەکردن لەسەر مەخلوقات و سیفات و تایبەتمەندیەکانی بەو شێوەی

واريد بووەلەشەرعدا ، دێتە سەر باسی زەوی لەپەڕەی 134 و دەڵێت : (إختلف العلماء في الاض هل هي كرة أم بسيطة فذهب إبن عباس وجمع كثير من أهل العلم على أنها بسيطة مستوية سطح من أربع الجهات وذهب بعضهم إلى أنها كالكرة وهو قول الفلاسفة) واتە : (زانایان ڕایان جیابووە لەسەر شێوەی زەوی ئایا تەختە یان گۆیی ، إبن عباس و بەشێکی زۆری زانایان پێیان وابووە ڕێک و تەختە بەهەر چوار ئاڕاستەکەدا وە بەشێکیان پێیان وایە وەك تۆپە ئەمەش قسەی فەیلەسووفەکانە) تێبینیەك لەسەر ئەو ووتەیەی کە (ابن عباس) کە صحابیە پێی وابووە زەوی تەختە : نەصێکی سەرێحمان بەدەستەوە نیە کە ئەو ئاماژەی بەوە دابێت زەوی تەختە ، بەڵام چەند ووتەیەکی هەیە ئاماژەن بۆ ئەوەی قسەی لەسەر ئەم باسە کردووە و باسی کردووە کە زەوی چۆنە ، لەدواییدا دێینە سەری ان شاءالله لەبابەتەکانی دیکەدا .

14. محمد الامين الهرري ، خاوەنی کتێبی (حدائق الروح والريحان) کە یەکێکە لە موفەسسیر و فەقیهەکانی مەزهەبی ئیمامی شافعی ، لەو کتێبە بەپێزەی کە سەرو 30 موجەللەدە ، لە جەلدی 31 پەڕەی 384 قسە لەسەر ئایەتی (والى الارض كيف سطحت) دەکات و دەڵێت : (يستدلون به أن الارض مسطوحة وعدم كونها كرة ، ومجاب هذا يقولون اذا كانت كرة عظيمة جدا يكون كل قطع منها كالسطح ، ولكن فرق بين سطح وكرة كانما أنه فرق بين بيض النعامة وبيض الحمامة) واتە : (ئەم ئایەتە بەبەڵگە هێنراوەتەوە زەوی تەخت بێت و گۆیی نەبێت ، ئەوانەی وەڵامی ئەم قسەیە دەدەنەوە دەڵێن ئەگەر زەوی گۆیەکی گەورە بێت ئەوها بەهۆی گەورەییەکەی هەربەشێکی وەرگرین بەتەختی دەردەکەوێت ، ئەمە لەکاتێکا جیاوازی نێوان تەخت و گۆی وەك جیاوازی نێوان هێلکەی نەعامە و هێلکەی کۆتر وایە) مەبەستی ئەوەیە ئەمە لەکوێ ئەوە لە کوێ ، ئەمە کۆمەڵێك بوو لەووتەی زانایان لەم بارەیەوە تاوەکو لەبێ بەڵگەییدا کەس هێرش نەکات و بڵێت خۆتان ئایەتەکان تەفسیر دەکەن ، کە هیچ کامیان تەفسیری ناوێ ئایەتەکان گشتی موحکەم و ڕوون و ئاشکران ، جا بەپشتیوانی الله عزوجل دەچینە سەر وەڵامی شوبهە و گومانەکان .

## ئایا چی لە ووتەی ئەوزانایانە بکەین کە وتوویانە زەوی گۆییە

بێگوومان ئێمە قاعیدەیەکمان هەیە ، کە بەهیچ شێوازێك پشت بە ووتەی زانا نابەستین بۆ پشت ڕاستکردنەوەی هیچ بابەتێك بەڵکو دەبێت بەڵگە بۆ قسەی زاناکە بێنینەوە بڵێین ئا ئەمە بەڵگەکەیەتی ، ئێمە باسی شەرع دەکەین کەوابوو پەنا بە قورئان و سوننەت و اجماع دەبەین ، بۆ ئەم باسە ئایەتی قورئانمان هێنایەوە گشتی باس لەتەختی و ڕاخراویی زەوی دەکات ، لە سوونەتیش ئەم باسە بوونی نیە ، اجماعیش نزیکی شەش دانە اجماعمان هێنایەوە هەریەك لەسەدەیەکی جیاواز ، بێگوومان نە ئەو اجماعانە نە ووتەکانمان وەرنەدەگرت ئەگەر بەبێ بەڵگە ئەو قسەیەیان بکردبا ، بەس دیاربوو گشتیان لە میانەی شیکردنەوەی ئەو ئایەتە موحکەمانە ئەو حوکمەیان دەرکردبوو ، کەوایە زانایەک شتێک دەڵێت دەبێت بڵێین کوا بەڵگەکەی ، ئێستا ناوی کۆمەڵێك لەزانایان دەهێنن کە گوایە وتوویانە زەوی گۆییە و ئەیکەنە ماڵ بەسەرمانەوە ، ئێمەش دوو خاڵ دەڵێین بەو کەسانە :

1. ئەگەر کێشەت زانایە ئێمەش ناوی نزیکی بیست زانامان هێناوە و بگرە شەشیان کۆدەنگی دەهێنێتەوە ئەی قسەی ئەمان چی ؟

2. قسەی زاناکەمان ناوێ بەڵکو بەڵگەی قسەکەیمان دەوێ چۆن ئەو زانایانەی باسمان کرد هەموویان قسەکانیان لەسەر ئایەتێك بووە .

جا لەدیارترین ئەو زانایانەی ناوی دەبەن بریتین لە (ابن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێێت ، دەڵێن لە مجموع فتاوی وتوویەتی : (واجمعوا على ان الارض بجميع اجرامها من البر والبحر مثل كرة) واتە : (کۆدەنگین لەسەر ئەوەی زەوی بەوشکانی و دەریاییەوە وەک تۆپ وەهایە) ، جا من گەرماو گەرم پێش وەڵام دانەوە بەو بەڕێزانە دەڵێم بۆ قسەکەی دەبڕن دوای ئەو قسەیەش بێنن کە دەڵێت : (واجمعوا على ان كرة الارض مثبتة في وسط كرة السماء كنقطة في وسط الدائرة) واتە : (وە کۆدەنگین لەسەر ئەوەی تۆپی زەوی وەستاو و جێگیرە لەناوەڕاستی تۆپی ئاسمان وەک چۆن نوکتەیەک لەناوەڕاستی بازنەیەکدا بێت) ئەم فەتوایانەش لە بەرگی 25 پەڕەی 195 ی مەجموعەکەی خۆیدایە ، ئەی بۆ ئەوەیان ناهێنن کە دەڵێت زەوی جێگیرە و سەنتەری ئاسمانە ؟ دەزانن ئەمەیان لەبەرژەوەندی خۆتان ئەدات چونکە زانستەکەتان واناڵێت ؟ ئنجا خاڵێکی تریش ، ئێ قسەکانی پێشتری نەقڵ بکەن ، سەرەتا دەڵێت : (وقال ابو جعفر بن المنادي ....) ئەو قسانە هی ابن المنادي ە دەیهێنێت کە نزیکی پێنج سەدە پێش خۆی ژیاوە و بەبێ سەنەد ئەم قسانە نەقڵ دەکات ، هەروەها کە دەڵێت اجمعوا واتە (کۆدەنگین)

لەشەرعدا كۆدەنگیەک بەر كۆدەنگیەكی تر بكەوێت ڕەد دەكرێتەوە و كامیان لە جیلی اصحاب و تابعین نزیک بوو ئەویان وەردەگیرێت ئێ ئێمە لەبەشەكانی پێشوودا نزیكی شەش كۆدەنگیمان هێنا كە ئەوەی (عبدالقاهر البغدادي و ابن عطية) بە نزیكی سێ بۆ چوار سەدە پێش ابن تیمیةن ڕەحمەتی الله لەهەموویان بێت ، وە كۆدەنگیەكەی (الثعالبي و جلال الدين المحلي) نزیكن لەسەردەمی ابن تیمیة ، وە هەروەها شێخی ئیسلام (ابن تیمیة) لەسەر ئەو قسە هیچ بەڵگەیەكی قورئان نەقڵ ناكات كە لەسەر چ ئەساسێك ئەم قسەیەی كردووە ، بەڵكوو بە قسەكەی دیاربێت كە دەڵێت خڕە و جێگیرە و ناوەڕاستی ئاسمانە دیارە كاریگەر بووە بە تیۆریە باوەكەی سەردەمی خۆی كە تیۆری جیۆسنتریكە كە وەک زوو ووتمان پێی وایە زەوی گۆییە و وەستاوە و سەنتەری ئاسمانە ، پاشان قسەی چەند زانایەكی دیكەی تر لەوانیش شێخ (ابن قیم) كە وتوویانە زەوی گۆییە ، ئێ ئەمیش دووبارە پێی وابووە گۆییەو جێگیرە بۆ قسەكەی تریشی ناهێنن ، لە (مفتاح دار السعادة) جوزئی یەك پەڕەی 209 دەڵێت : (ثم تامل الحكمة من طلوع الشمس على العالم كيف قدره العزيز العليم سبحانه فإنها لو كانت في موضع من السماء فتقف فيه ولاتعدوه لما وصل شعلعها إلى كثير من الجهات لأن ظل احد جوانب كرة الارض يحجبها عن الجانب الاخر وكان يكون الليل سرمدا على من لم تطلع عليهم والنهار سرمدا على من هي طالعة عليهم فيفسد هؤلاء وهؤلاء ، فاقتضت الحكمة الالهية والعناية الربانية أن قدر طلوعها من أول النهار فتشرق على من قابلها من الافق الغربي ثم لاتزال تدور وتغشى جهة بعد جهة حتى تنتهي الى المغرب فتشرق على ما استتر عنها في أول النهار فيختلف عندهم الليل والنهار فتنتظم مصالحهم) واتە : (پاشان لەحیكمەتەكانی الله هەڵاتنی خۆرە بەسەر جیهاندا كە چۆن ڕێكی خستووە زاتی باڵادەستی زانایان ، جا خۆ ئەگەر خۆر لە شوێنێكی ئاسمان بوەستایە و ڕووناكی نەیدایە لەشوێنەكانی تری زەوی چی ڕووی دەدا چونكە گۆی زەوی ئەو لایەی خۆر لێی نادات شەوە ئەوەی تریش ڕۆژە جا وەهابایە هەردوولا زەرەرمەند دەبوون ، بەڵام بە حیكمەت و گەورەیی پەروەردگار خۆر هەڵدێت لەسەر شوێنێک و ڕووناكی دەكات پاشان دەسووڕێتەوە و لایەكەی تر دەبێتە ڕۆژ و لەوێش ئاوادەبێت و لەوێ هەڵدێت و بەم جۆرە شەو و ڕۆژ ڕوودەدات و خەڵكی مەسڵەحەتەكانی لێ بەدەست دێنن) یاخود دەڵێن (ابن حزم) یش وتوویەتی زەوی گۆییە ، ئەی بۆ باسی ئەوە ناكەن (ابن حزم) تەكفیری ئەو كەسە دەكات كە ئینكاری لەسوڕانی خۆر بكات بەدەوری زەوی ؟ لە (فصل في الملل) جوزئی 2 پەڕەی 80 دەڵێت : (اخبر الله تعلى لا يرده الا الكافر بان الشمس في

السماء والقمر أيضا في السماء والمشاهد بالاعيان دورانهما حول الارض من المشرق الى المغرب) واته : (الله هەواڵی داوە و کەس ڕەددی ناکاتەوە کافر نەبێت وە بەچاوەکانی سەر دەبیینین کە خۆر و مانگ لەئاسمانن و هەردووکیان بەدەوری زەویدا دەسووڕێنەوە لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا) .

## شێوە و پێکهاتەی ئاسمانەکان

بێگوومان هیچ ڕاجیاییەک نیە لەبوونی حەوت چین ئاسمانی یەک لەسەر یەک وەک خوای پەروەردگار لەقورئانەکەیدا هەواڵی داوە ، بەڵام ئایا شێوەی ئاسمان چۆنە وە لەچی پێک هاتووە ، بێگوومان سەرەتا پێویستە بڵێین ئاسمان بۆشایی نیە وەک ئەوەی کۆزمۆلۆجی ئەمڕۆ باسی لێوە دەکات بەڵکو ماددەیەکە و الله سبحانه وتعلى پێکهاتەکەی دەزانێت ، وەک خۆی دەفەرموویت : (وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَاهَا) یاخود لەچەندین ئایەتی دیکە باس لەوە دەکات ئاسمانەکان (بناء) کراون وە (بناء) واتە : (بنیاتنان) وە بێگوومان ماددە بنیات دەنرێت نەک بۆشایی ، سەبارەت بەشێوەکەیشی دوو ڕا هەیە لەنێوان زانایان بەپشت بەستن بە دەقە شەرعیەکان و تێڕوانینی جیاواز ئەم دوو ڕایە درووست بووە ، هەندێک لەزانایان پێیان وایە ئاسمان ڕێک و ڕاستە ، واتە تەختە ، ئەمەش بەپێی قسەی (خطيب الشربيني) بێت ڕای زۆرینەی زانایانی تەفسیر بووە ، وەک لە کتێبی (السراج المنير) جوزئی سێیەم پەڕەی 240 دەڵێت : (اكثر المفسرين على ان السموات مبسوطة كصحف مستوية لقوله تعلى : يوم نطوي السماء كطي السجل للكتب) واته : (زۆرینەی موفەسیرەکان لەسەر ئەوەن ئاسمانەکان تەختن وەک پەڕە ڕێکن ئەمەش لەسەر ووتەی خوای پەروەردگار کە فەرموویەتی : ڕۆژێک دێت ئاسمان دەپێچینەوە وەک پەڕەی پەرتوک) ، جا ئیمامی (ابو عمرو الداني) کە لە سەدەی سێیەمی کۆچی ژیاوە لەکتێبی (الرسالة الوافية) کە کتێبەکەی داناوە بۆ باسکردنی ڕایەکانی اهلی سوننە لە پەڕەی 212 ئەم ڕایە دەداتە پاڵ ڕای اهلی سوننە و دەڵێت : (ومن قولهم : ان السموات السبع طباق بعضهن فوق بعض مسطحات) واته : (لەقسەکانی اهلی سوننە : ئاسمانەکان حەوت چین ئاسمانی تەختی یەک لەسەر یەکن) ، لەپاڵ ئەم ڕایە ڕایەکی دیکە هەیە کە شێوەی ئاسمانەکان وەک گومەزی مزگەوت وەهایە واتە وەک (قوببە) ، ئەم ڕایەش بەچەند سەنەدێک لە سەلەف گێڕدراوەتەوە بە نموونە ئیمامی (الطبراني) دەیگێڕێتەوە لە تەفسیرەکەی خۆی جوزئی دووەم پەڕەی 49 کە (ابن عباس) فەرموویەتی : (كل السماء

مطبقة على الاخرى ، وسماء الدنيا ملتزقة اطرافها بالارض) واته : (هەموو ئاسمانێک بەسەر ئەوەی دوای خۆوەیەتی وە ئاسمانی دوونیا لێوارەکانی بەستراوەتەوە بەزەوییەوە) واتە زەوی شێوەی بازنەییە و ئاسمانی دوونیاش وەک گومەزی مزگەوتێکە بەسەرییەوە ، وە (جلال الدين السيوطي) لەتەفسیرەکەی (الدرر المنثور) لەتەفسیری ئایەتی 22 سورەتی (البقرة) قسەی دوو لە تابیعیەکان دێنێت (اياس بن معاوية ، وهب بن منبه) کە وتوویانە ئاسمان وەک گومەز وەهایە بەسەر زەوییە ، بەهەرحاڵ لەنێوان ئەم دوو ڕایە ڕای یەکەمیان بەهێزترە سەبارەت ڕایەکەی تر هیچ کێشەیەک درووست ناکات وەک دیارە ئەثەرەکانی سەلەف باس لەئاسمانی دوونیا دەکەن واتە ئەو چینە ئاسمانەی بەسەرمانەوەیە ، بۆیە دەتوانین بڵێین بەڵێ ئەو چینە ئاسمانەی سەرمان وەک گومەز وەهایە و ئاسمانەکانی دیکەی سەروخۆی ڕێک و ڕاستن ، الله اعلم .

## ئەو ئایەتانەی دەکرێنە بەڵگە بۆ ئەوەی زەوی گۆییە گو ایە

یەکەم و بەهێزترین شوبهە و گوومان بڵاو دەکرێتەوە و خەڵك پشتی پێ قاییمە بریتیە لەم ئایەتەی سورەتی النازعات : (وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا) واتە : (وەزەویشی لەپاشاندا ڕاخستووە) مەبەستی لەپاش درووستکردنی ئاسمانەکان ، جا دێن دەڵێن (دحاها) واتە هێلکەی نەعامە ، تەبعەن سێ تێبینی بچوک ئەدەم پێش چوونە ناو وەڵام دانەوە :

1. هەرچی تەرجومەی کوردیە بگەڕێ (ڕامان ، پوختە ، ڕێبەر ...) هەرهەمووی لەواتای ئایەتەکە دەڵێن : (وە زەویشی لەپاشان ڕاخست) بەس تەفسیری ئاسان دەڵێت واتە : (وە زەویشی خستە سەر شێوەی هێلکەیی) جا جەنابتان بۆ بەس ئەم تەرجومە هەڵەیە دەبینن ؟ ئەوە نەبێت تەرجومەی کوردی پشتی زۆر پێ ببەسترێت بەس خەڵکەکە دەزانێت لەوانەدا بگەڕێت .
2. هەڵەیەکی ژەهراوییە بڵێی (دحاها) واتە هێلکەی نەعامە ، هێلکەی نەعامە (اسم) ە واتە ناوە ، بەڵام (دحاها) فعلە واتە کارە خۆ دەبینیت جێناوی (ها) ی پێوەیە ، بەس (فعل) جێناوی دەچێتە سەر .

ئنجا بۆ وەڵامەکەی ، سەرەتا تەحەددایەک ڕادەگەیەنم ، تەحەددا ئەکەم لەکۆنترین تەفسیر کە گەشتبێتە دەستمان کە هی (ابن جرير الطبري) ە تا نوێترین تەفسیری اهلی علم یەک تەفسیریان وتبێتی (دحاها) واتە هێلکەی نەعامە ، بگرە بەس وتبێتی یەکێک لە ماناکانی ئەوەیە ، ئیتر ئەوە هەمووی کتێبی تەفسیرە ، هی (الطبري ، القرطبي ، البغوي ، الماوردي ، ابن عطية ،

ابو حیان ، ابن كثیر ، الجلالین ...... هەموو ئەوانی تریش) بۆ دەستكەوتنی كتێبە تەفسیرییەكان زۆر ئاسانە بڕۆنە كرۆم و گووگڵ بنووسن : (كتب التفسیر مكتبة الوقفیة) سەرو 400 كتێبی تەفسیر دەهێنێت ، تەحەددا ئەكەم دانە بەدانەی بگەڕێن تەفسیری ئەو ئایەتە یەک عیباد بەشەر ووتبێتی بەواتای هێلكە دێت ، بە ئیسراحەتی خۆت بگەڕێ ، لەتەفسیری ئەم ئایەتە (ابن كثیر) دەڵێت : (قال مجاهد وقتادة وضحاك والسدي والثوري وأبوصالح وإبن زيد (دحاها) أي بسطها ، وهذا أشهر اقوال وعليه أكثر المفسرين وهو معروف عند أهل اللغة) واتە : (موجاهید و قەتتادە و ضحاك و سوددی و ابن زید دەڵێن (دحاها) واتە ڕایخستووە ، ئەمەش بەناوبانگترین و بەهێزترین قسەیە و زۆترینی موفەسسیرین لەسەر ئەمەن و شتێكی ناسراو و زانراوە لای زمانەوانان) وە (القرطبي) دەڵێت : (قال عامة المفسرين طحاها ودحاها واحد بمعنى بسطها من كل جانب) واتە : (تەواوی موفەسسیرین دەڵێن (طحاها و دحاها) بەیەک واتا دێن بەواتای ڕاخستن بەهەموو لایەكدا) ئەرێ پێمان ناڵێیت (هێلكەی نەعامە) لەكوێ هات ؟

سەبارەت بە قامووسە عەرەبیەكانیش ، دووبارە تەحەددا دەكەم یەک قامووس بهێنرێت قامووسە موعتەبەرەكانی كۆن شتی وای ووتبێت ، ئێستا من بەهێزترین قامووسەكانی زمانی عەرەبی دەهێنم ، لەناویاندا قامووسی (لسان العرب) كە (ابن منظور) خاوەنیەتی ، لە واتای (دحاها) دەڵێت : (الدحو : البسط ، دحا الله الارض : بسطها ، والادحي والادحية والادحوة : مبيض النعام في الرمل) واتە : (الدحو : ڕاخستن ، الله زەوی دحا كردووە یانی : ڕایخستووە ، الادحي و الادحية و الادحوة : شووێن هێلكەی نەعامە لە لمدا) جا بینیتان ؟ فعلی (دحا) واتای ڕاخستنە ، وە (الادحية) كە لە موشتەقاتی فعلەكەیە بە واتای (مبيض النعامة) دێت واتە (شووێن هێلكەی نەعامە) جا (بيض) هێلكەیە بەڵام (مبيض) شووێن هێلكە ، وە؟قامووسی (الصحاح) كە (الجوهري) خاوەنیەتی دەڵێت : (دحوت شيئا أي بسطته ، ومدحى نعامة : موضوع بيضها) واتە : (شتێک دحو بكەیت یانی ڕات خستووە ، مدحى ەی نەعامە : شووێن هێلكەكەی) وە لە (قاموس المحيط) كە هی (فيروز الابادي) ە هاتووە : (دحا الله الارض يدحوها ويدحاها : بسطها والادحية والادحوة : مبيض النعام في الرمل) واتە : (الله زەوی دحا كردووە واتە ڕایخستووە وە الادحية و الادحوة : شووێن هێلكەی نەعامەیە لە لمدا) وە لەقامووسی (الجمهرة اللغة) هی (ابن دريد) هاتووە : (أدحي النعام : موضوع الذي يبيض فيه) واتە : (ادحي نەعامە : ئەو شووێنەی هێلكەی تێدا دەكات) وە لەقامووسی (المحيط في اللغة)

ى (صاحب بن عباد) هاتووه : (الدحو : البسط والادحي : موضوع التي تبيض فيه النعامة) واته : (الدحو : ڕاخستن وه الادحي : شووێنێكه نهعامه هێلكهى تێدابكات) ، وه له موعجهمى (الالفاظ العامية) پهڕهى 233 هاتووه : (وقد أطلق العرب اسم الادحية على المكان الذى تبيض فيه النعامة وليس بيضها) واته : (عهرهب ناوى الادحية ەى بهكارهێناوه بۆ ئهو شووێنهى نهعامه هێلكهى تێدادهكات نهك هێلكهكهى) ، ئیتر سبحان الله یانى بهس بزانم ئهو قسهیه لهكوێوه هاتووه (دحاها) بهواتاى هێلكهى نهعامه بێت ، ئنجا ئێستاش یهكلایى ببنهوه گۆییه یان هێلكهیى

دواى ئهوه دووهم ئایهت كه بهڵگهى پێ دههێننهوه بریتیه لهم ئایهته له سورهتى (الزمر) : (خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ...) واته : (الله ئاسمانهكان و زهوى درووست كردووه به حهق وه شهو دهپێچێت بهسهر ڕۆژدا و ڕۆژیش دهپێچێت بهسهر شهودا ...) جا بهم شێوهیه ئایهتهكه دهكهنه بهڵگه كه ووشهى (یكور) هاتووه كه به واتاى (پێچانهوه) دێت ، وه لهقامووسهكان دهڵێن له (كار العمامة) هاتووه ، واته (شهو و ڕۆژ دهپێچرێن بهسهر یهكدا وهك پێچى مێزهر) گوایه ئهگهر بهكهوانهیى و پێچانهوه شهو بچێت بهسهر ڕۆژدا و ڕۆژ بچێت بهسهر شهودا كهوایه زهوى دهبێت گۆیى بێت ، به دوو خاڵ وهڵام دهدهینهوه :

1. ئهگهر سهیرى تهواوكراوى ئایهتهكه بكهن پاش باسكردنى عهمهلیهى (تكویر) الله جل جلاله دهفهرمووێت : (وسخر الشمس والقمر كل یجري لاجل مسمى) واته : (وه خۆر و مانگى ڕام هێناوه و ههریهكهیان تاكاتى خۆیان لهسوڕانهوه بهردهوامن) زۆر جوان عهمهلیهى (تكویر) ەكه دهداته پاڵ سوڕانهوهى خۆر ، ههروهها ئهو پرۆسهیه لهسهر زهویهكى تهختیش زۆر ئاساییه بهڵێ شهو دهپچێرێت بهسهر ڕۆژدا و بهپێچهوانهشهوه ئهم پرۆسهیه بهسهر زهویدا جێبهجێ دهبێت ، وه ئهگهر لهلایهنى زمانهوانى سهیرى بكهین كه دهڵێت له (كار العمامة) وهرگیراوه مهبهستى ئهوهیه زهوى وهك سهرێك وابێت ئهوا شهو و ڕۆژ مێزهرهكهى و بهسهریدا ئهپێچرێت لێكهوه ، ئێ باشه كهسێک مێزهر دهبهستێت ئایا سهرى ڕائهگرێت مێزهرهكهى تێ ئهپێچێت یان مێزهرهكه ڕائهگرێ و سهرى ئهخولێنێتهوه بهدهورى مێزهرهكه ؟ بێگوومان سهرى ڕائهگرێ و مێزهرهكهى تێ ئهپێچێ ، ئهگهر بڵێى زهوى دهخولێتهوه و بهمه شهو و ڕۆژ درووست دهبێت كهوایه وهك ئهوهیه مێزهرهكه بگریت كه بریتیه له شهو و ڕۆژهكه وه سهرتى بهدهورا بخولێنیتهوه كه بریتیه له زهوییهكه ، جا ئهم قسهى كردمان دهتوانن

بڕواننە کتێبی (مفردات الفاظ القرآن) لەنووسینی راغب الاصفهاني (343 کۆچی) لە شیکردنەوەی ووشەی (کور) دەڵێت : (کور الشىء : إدارته وضم بعضه إلى بعض كَكور العمامة ، وقوله تعالى : ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهارِ وَيُكَوِّرُ النَّهارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ [الزمر : 5] فإشارة إلى جريان الشمس في مطالعها وانتقاص الليل والنهار وازديادهما) واتە : (کور کردنی شتێک : پێچانەوە و کۆکردنەوەی شتێک بەسەر شتێکی تردا وەک پێچانەوەی مێزەر ، وە ووتەی اللە‌ی بەرز : (يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهارِ وَيُكَوِّرُ النَّهارَ عَلَى اللَّيْلِ) ئاماژەیە بۆ سوڕانەوەی خۆر لە هەڵاتگەکانیەوە وە کەمبوونەوەی شەو و زیادبوونی ڕۆژ وە پێچەوانەشی) جا سەیر بکەن بەڵگەیەکتان هێنایەوە کە بەڵگەیە لەسەر خۆتان نەك بەڵگە بێت بۆتان .

2.ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تەفسیری زانایان ، یەك زانا نابینین ئەم ئایەتەی کردبێتە بەڵگە لەسەر گۆیی بوونی زەوی ، ئیتر نازانین ئەم عەباقیرانەی ئەمڕۆ لەکوێ گەشتن بەم خاڵە موهیمە جەوهەرییە ، ئەوە تەفسیری ئیمامی (الطبري) ە ووتەی سەلەفمان بۆ نەقڵ دەکات لەسەر تەفسیری ئایەتەکە و دەڵێت :

يقول : يغشي هذا على هذا وهذا على هذا كما قال ﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾ وبنحو الذي قلنا في ذلك قال أهل التأويل ذكر من قال ذلك :

عن ابن عباس قوله: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ يقول: يحمل الليل على النهار .

عن مجاهد قوله: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ﴾ قال: يدهوره .

عن قتادة قوله: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ قال: يغْشى هذا هذا ويغشى هذا هذا .

عن السدي قوله: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ قال: يجيء بالنهار ويذهب بالليل ويجيء بالليل ويذهب بالنهار .

قال ابن زيد في قوله: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ حين يذهب بالليل ويكور النهار عليه ، ويذهب بالنهار ويكور الليل عليه .

واتە : اللە دەڵێت : شەو بە ڕۆژ دادەپۆشێت وە ڕۆژیش بەشەو وەك چۆن لەئایەتێکی تردا دەڵێت : (شەو تێهەڵدەکێشین بەسەر ڕۆژدا وە ڕۆژیش بەسەر شەودا) جا لەسەر ئەمەی ووتمان ئەهلی تەئویلیش ڕەئیان وایە ، لەوانەی وادەڵێن :

ابن عباس لەسەر ئایەتی ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ دەڵێت : شەو

هەڵدەگرێت دەیدا بەسەر ڕۆژدا وە بەپێچەوانەش .
موجاهید لەسەر ئایەتی ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ دەڵێت : واتە ئەم دادەبەزێنێ بەسەر ئەودا و ئەویش بەسەر ئەمدا ( تێبینی : ئیمامی موجاهید کە دەڵێت یدهوره واتە دابەزاندن جا مەبەستی دابەزینی شەوە بەسەر ڕۆژدا و ڕۆژ بەسەر شەودا) .
قەتتادە لەسەر ئایەتی ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ دەڵێت : ئەو ئەم دادەپۆشێت ئەمیش ئەو دادەپۆشێت .
سوددی لەسەر ئایەتی ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ دەڵێت : ڕۆژ دێت و شەو دەڕوات وە شەو دێت و ڕۆژ دەڕوات .
ابن زید لەسەر ئایەتی ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ دەڵێت : کاتێک شەو دەڕوات ڕۆژ دەپێچرێت بەسەریدا وە کاتێک ڕۆژ دەڕوات شەو دەپێچرێت بەسەریدا .
وە ئیمامی (ابن كثير) لەتەفسیری ئایەتەکە دەڵێت : (يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ ، اي : سخرهما
يجريان متعاقبين لا يقران ، كل منهما يطلب الاخر طلبا حثيثا ،
كقوله : (يغشي الليل النهار يطلبه حثيثا) هذا معنى ما روي عن ابن عباس ومجاهد وقتادة والسدي وغيرهم) واتە : (يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ ، واتە : خودا بەدی هێناون یەک لەدوای یەک و ناسرەوێن ، هەریەکەیان بەدوای ئەوی تردا دێت بەپەلە وەك چۆن لەو ئایەتەی تر دەڵێت : (ڕۆژ بە شەو دادەپۆشێت و ڕۆژیش بەپەلە دەکەوێتە شووێنی شەو) ئەمەش واتای ئایەتەکەیە وەك لە ابن عباس و موجاهید و قەتتادە و سوددی و جگە لەوانیش ڕیوایەت کراوە) ، جا لەوە زیاتر تەفسیری دیکە ناهێنم شتەکە ڕوون و ئاشکرایە بۆ کەسێك کە بیەوێت تێبگات .
سێیەم ئایەت کە دەیکەنە بەڵگە بریتیە لەئایەتێکی سورەتی (الرحمن) کە الله جل جلاله دەفەرمووێت : (رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ) واتە : (پەروەردگاری دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاواکە) ، دەڵێن ئەگەر زەوی گۆیی بێت لەسەر لایەکی خۆر هەڵدێت و ئاوا دەبێت پاشان لەسەر لایەکەی تر هەڵدێت و ئاوا دەبێت ئەمەش دەکاتە دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا ، بۆ مەگەر لە زەوی تەختدا خۆر بەجارێک هەڵدێت و ئاوا دەبێت بەسەر زەویدا ؟ لەسەر زەوی تەختیش وەهایە ، لەسەر لایەکی بازنەکە هەڵدێت و ئاوا دەبێت پاشان دەچێتە سەر نیوەکەی تری بازنەی زەوی هەڵدێت و ئاوادەبێت ئەمەش دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا ، وەلەو

ئایەتەکە باسی ئەوە ناکات و گەر بڕۆی سەیری تەواوی تەفسیرەکان بکەیت دەڵێن مەبەستی دوو ڕۆژهەڵات شوونی هەڵاتنی خۆرە لە هاوین و زستان وە دوو خۆرئاوا مەبەستی شوونی ئاوابوونی خۆزە لە هاوین و زستان ، هەر بڕواننە تەفسیری ڕامان کە تەفسیرێکی کوردیە ، چونکە زانراوە کە خۆر لە زستان لە شوونێک هەڵدێت وە لەهاوین لەشوونێکی تر هەڵدێت وە بۆ ئاوابوونیش هەروەها ، ئەمەش لەزەوی تەختدا بەهۆی گۆڕانی خولگەی خۆرەوەیەوە کە وەرزەکان درووست دەبێت ، ئیمامی (الطبري) لەتەفسیری ئایەتەکە دەڵێت : (رب المشرقين ، يعني بالمشرقين : مشرق الشمس في الشتاء ومشرقها في الصيف ، وقوله : ورب المغربين ، يعني : ورب مغرب الشمس في الشتاء

ومغربها في الصيف وعن ابن أبزى قال : مشارق الصيف ومغارب الصيف ، ومشارق الشتاء ومغارب الشتاء ، وعن مجاهد قال : مشرق الشتاء ومغربه ومشرق الصيف ومغربه ، وعن القتادة قال : فمشرقها في الشتاء ومشرقها في الصيف وعن ابن زيد قال : أقصر مشرق في السنة وأطول مشرق في السنة وأقصر مغرب في السنة وأطول مغرب في السنة)

واتە : (رب المشرقين ، واتە سوێند بە پەروەردگاری دوو ڕۆژهەڵاتەکە یەکیان لەزستان یەکیان لەهاوین ، وە رب المغربين یانی سوێند بە پەروەردگاری دوو ڕۆژئاواکە لە زستان و هاویندا ، وە ابن أبزى دەڵێت : ڕۆژهەڵاتەکانی هاوین و ڕۆئاواکانی وە ڕۆژهەڵاتەکانی زستان و ڕۆئاواکانی ، وە موجاهید دەڵێت : ڕۆژهەڵاتی زستان و ڕۆژئاواکەی وە ڕۆژهەڵاتی هاوین و ڕۆژئاواکەی ، وە قەتتادە دەڵێت : ڕۆژهەڵاتی خۆر لە زستان و لەهاوین ، ابن زیدیش دەڵێت : کورتترین ڕۆهەڵات لەساڵدا و درێژترینی وە کورتترین ڕۆژئاوا لەساڵدا و درێژترینی) ، جا بڕۆ سەیری کامە تەفسیر دەکەیت بەم شێوازەیە واتای ئایەتەکە بۆیە چی تر ئایەت دامەتاشن بۆ بەرژەوندی سەرخستنی بیرۆکەیەکی بەتاڵی بێ مانا تکایە .

## سەرەتای درووستبوونی زەوی و ئاسمانەکان

بەدرێژایی مێژوو چەند قسەیەک کراوە لەسەر چۆنیەتی درووستبوونی زەوی و ئاسمان و سەرەتاکەیان ، وەلەو لە (کۆزمۆلۆجی) ئەمڕۆدا شتێك بوونی نیە بەناوی ئاسمان بەڵکوو ئەوەی هەیە بریتیە لە بۆشایی (Space - الفضاء) کە گەردوونێکی بێ سەرەو بەرەیە و بە ملیاران ملیار سیستمی هاوشێوە بەناو سیستمی خۆری تێدایە ، کە کەس تێناگات و نازانێت ئەم شتانەیان لەکوێ زانی ، وە باوەڕیان بە فرە گەردوونی

هەیە کە پێیان وایە چەندەها گەردوون هەیە کە ئەمەش دووبارە کەس نازانێت لەکوێوە هێنایان ، وە تەواوی بوون بێمانا دەکات و پێت دەڵێت ئەم زەوییەی الله فەراهەمی هێناوە بۆ بەندەکانی هیچ نیە لەچاو سیستمی خۆردا چ جای بڵێین لەچاو گەردوون ، لە چاو سیستمی خۆر وەك هەڵماتێکە فرەی بدەیتە ژوورێکی زۆر گەورەوە ، وە دەنکێک تۆز کە بەچاو نابینرێت لەچاو گەردوون ، بەڵام ئێمە پێمان وایە نەخێر زەوی بەو ڕادەیە بچوك و بێ نرخ نیە بەڵکوو گەورە و بەنرخە ، ئەمەش بە دوو بەڵگە کە دەیسەلمێنێت کە گەورەیە :

1.الله جل جلاله لەهەرجێیەک باسی ئاسمانەکانی کردبێت باسی زەویشی کردووە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەم دووانە هاوتا و تەواوکەری یەکن ، ئەمیان بەرزاییە ئەویان نزمایی ، وەک چۆن خۆر و مانگی هەمیشە پێکەوەهێناوە چونکە وەك خۆی دەفەرمووێت هەردووکیان فەراهەم هاتوون و دێن و دەچن بۆ خزمەتی بەندەکان ، بڕواننە قورئان لەم دەستەواژە زۆر بەدی دەکەن : (ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ) هەرگیز بە جودایی لێك نەهاتوون .

2.ئایەتێکی تری الله جل جلاله بە ڕوونی بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پانتایی زەوی بەوێنەی ئاسمان ئەویش کاتێك دەفەرمووێت لەسورەتی (الحدید) ئایەتی 21 : (سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ ...) واتە : (وە کۆشش بکەن و پێشبڕکێ بکەن بۆ لێخۆشبوونی پەروەردگارتان بۆ بەهەشتێک کە پانتاییەکی بەوێنەی پانتایی ئاسمان و زەوییە) ئایا دەکرێت زەوی لەچاو بۆشایی ئاسمان وەك ناوکی خەردەلەیەك بێت و خودای پەروەردگار پانتایی بەهەشت بچووێنێ بە پانتایی زەوی و ئاسمان ؟ بەنموونە پارچەیەک زەویم هەیە ، دەڵێم ئەم پارچە زەوییەم پانتاییەکەی هێندەی پانتایی پارکی هەواری شاری سلێمانی و پانتایی ئەم سیم کارتەی دەستمە ؟ بێگوومان ناگونجێت .

3.ئەگەر سەیری قورئان بکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژ درووست بوون وە زەویش پێش ئاسمان درووست بووە ، زەوی چوار ڕۆژی پێچووە ئاسمانیش دوو ڕۆژ ، باشە دەکرێت زەوی بەو بچوکیە چوار ڕۆژی بووێت و ئاسمان بەو گەورەییە دوو ڕۆژ ؟ یان دەکرێت زەوی لەناو بۆشایی ئاسماندا بێت لەکاتێکا زەوی پێش ئاسمان درووست بووە ؟ دەپرسیت بەڵگەکان چیە لەسەر ئەمە ، بێگوومان بەڵگەی درووست بوونی ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا زۆرە بڕواننە (الاعراف 54 ، یونس 3 ، هود 7 ، الفرقان 59 ، السجدة 4 ، ق 38 ، الحدید 4) بەنموونە (الحدید 4) : (هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ) واتە : (الله ئەو زاتەیە ئاسمانەکان و زەوی درووست

کردووه له شەش ڕۆژدا پاشان چووه سەر عەرشی خۆی) ئایەتەکانی دیکەش بەهەمان شێوەن ، ئەی ئایا بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی زەوی پێش ئاسمان درووست بووه ، بەڵگەمان چەند ئایەتێکی سورەتی (الفصلت) ە کە چۆنیەتی درووستبوونی ئاسمانەکان و زەوی بە پلەبەندی و بەجوانی بۆمان ڕوون دەکاتەوە لەچەند ئایەتێکی یەک لەدوای یەک ، بەئایەتی 9 دەست پێ دەکات و دەفەرموویت : (قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ) واته : (ئەی محمد پێیان بڵێ : ئایا ئێوه کوفر ئەکەن بەو خوایەی کە زەوی دروست کردووه لە دوو ڕۆژدا کە ڕۆژی یەکشەممەو دووشەممە بووه وە ئێوه هاوبەش و شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار ئەدەن ئەم خوایە پەروەردگاری هەموو جیهانە چۆن دەبێت دروستکراوی لاوازی بێدەسەڵات بکرێتە هاوبەشی) ئەمە لە شەش ڕۆژەکە دوانی ڕۆیشت بۆ درووستکردنی زەوی بە گشتی ، پاشان ئایەتی 10 دەفەرموویت : (وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ) واته : (لەسەرووی زەویشەوە ئەو شاخانەی چەقاندووەو جێگیر کردووه وەکو مێخ وە بەرەکەتی خستۆتە ناو زەویەوە کە دانەوێڵەو ڕووەکی لێ دەڕوێت وە ڕزقیشی تیادا دیاری کردووه لە ڕۆژی سێ شەممەو چوار شەممە بە دوو ڕۆژەکەی پێشترەوە دەکاتە چوار ڕۆژ ئەمە وەڵامێکە بۆ ئەو کەسانەی کە پرسیار ئەکەن کە زەوی و ئەوانەی کە لەسەر زەویە لە دارو ئاو و ئەوانە لە چەند ڕۆژدا دروست بووه) ئەمە لە شەش ڕۆژەکە چواری ڕۆی ، دووی بۆ درووستبوونی زەوی دووش بۆ درووستکردن و تەواوکردنی وردەکاریەکانی سەر زەوی ، ئێستا دوو ڕۆژ ماوه و لەئایەتی 11 دەفەرموویت : (ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ) واته : (پاشان خوای گەوره ویستی ئاسمانەکانی بوو وە یەکسەر حەوت ئاسمانی دروست کرد و ڕێکیخست (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زەوی پێش ئاسمان دروستکراوه) وه (استوى) لە قورئاندا بە سێ مانا هاتووه : بەواتای (إلى) بەمانای ویست لەسەر بوون دێت وەکو ئەم ئایەتەی سەرەوه وە بەواتای (على) بە مانای بەرزو بڵند بوونەوە دێت وەکو ئەم ئایەتە: (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى) وه بە تەنهایش بەبێ حەرف بەمانای پێگەیشتن و کامڵا بوون دێت وەکو ئەم ئایەتە : (وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَى آتَيْنَاهُ حُكْماً وَعِلْماً) ، ئەو کاتە ئاسمان دووکەڵ بوو یان هەڵمی ئاوی سەر زەوی بوو خوای گەوره بە ئاسمانو زەوی فەرموو یان بە گوێڕایەڵی خۆتان یان بە پێناخۆش بوونی خۆتان فەرمانی من جێبەجێ بکەن ئەی ئاسمان خۆرو مانگو ئەستێرەکان دەربکە وە ئەی زەوی ڕووبارو دەریاو

کانیا و و بەرهەم و ڕووەکت دەربکە وتیان : ئەی پەروەردگار هەردووکمان ملکەچو گوێڕایەڵین بۆ فەرمانی تۆ) لەم ئایەتەدا بۆمان ڕوون دەکاتەوە پاش درووستکردنی زەوی الله جل جلالە ویستی بوو ئاسمانەکانیش درووست بکات بۆیە دەستی کرد بە درووستکردنیان و بە دوو ڕۆژ کۆتایی بەوانیش هێنا وەک لەئایەتی 12 دەفەرمووێت : (فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) واتە : (خوای گەورە ئاسمانیشی کرد بە حەوت ئاسمان لە ماوەی دوو ڕۆژدا کە ڕۆژی پێنج شەممە و هەینی بوو وە لە هەر یەکێك لە ئاسمانەکاندا خوای گەورە فەرمانی خۆی جێگیر کرد کە ئەو ئاسمانانە چۆن و بە چ یاسایەك بڕۆن و چیان پێویستە وە ئاسمانی دونیاشمان ڕازاندەوەو جوانمان کرد بەو ئەستێرانەی کە تیایەتی وە ئەو ئەستێرانە پارێزەریشن لەو شەیتانانەی کە ئەیانەوێ بەرز ببنەوەو هەواڵی ئاسمان بێنن بۆ فاڵچیو جادووگەران وە شەیتانەکانی پێ ئەسووتێنین ئەم ویست و دانراو و یاسا ڕێکوپێکە لە دانانی خوایەکە کە زۆر بەعیززەت و زانایە) ئەوە بەم چوار ئایەتە سەلماندمان کە زەوی لەپێش ئاسمان درووستبووە بە ماوەی چوار ڕۆژ و ئاسمانیش دوو ڕۆژی پێچووە ، ئایا تا ئێستا پێت وایە زەوی دەنکە لمێکە لەچاو بیابانێکدا ؟ پێت وایە زەوی لەناوی بۆشایی ئاسماندایە لەکاتێکا زەوی لەپێشدا درووستبووە و ئاسمان بەدوایدا ؟ (تێبینی : وەرگێڕانی ئایەتەکە وەرگیراوە لەتەفسیری ڕێبەر) هەر لەسەر ئەم بابەتە لە صحیحی بوخاری (كتاب التفسير . تفسير سورة السجدة) حەدیثێکمان لە صەحابی بەڕێز (ابن عباس) ڕەزاو ڕەحمەتی اللەی لێبێت ڕیوایەت دەکات کە فەرموویەتی : (وخلق الأرض في يومين ، ثم خلق السماء ، ثم استوى إلى السماء ، فسواهن في يومين آخرين ، ثم دحى الأرض ، ودحيها : أن أخرج منها الماء والمرعى ، وخلق الجبال والجماد والآكام وما بينهما في يومين آخرين ، فذلك قوله : (دحاها) وقوله (خلق الأرض في يومين) فخلقت الأرض وما فيها من شيء في أربعة أيام ، وخلقت السماوات في يومين) واتە : (الله زەوی لە دوو ڕۆژدا درووست کردووە پاشان ئاسمان ، ویستی لەسەر بوو ئاسمان درووست بکات و بە دوو ڕۆژ دواتر ئاسمانی ڕێکخست پاشان زەوی دحی کرد ، دحيها : یانی ئاو و لەوەڕی لێ دەرکرد ، وە شاخ و کێو و دۆڵی تێدا دەرکرد لەماوەی دوو ڕۆژی تردا ، واتە بە چوار ڕۆژ زەوی و ئەوەی تێیدایە درووستی کرد وە ئاسمانەکانیشی بە دوو ڕۆژ درووست کرد) وە لە حەدیثێکی تردا ئیمامی (البيهقي) لە کتێبی (الاسماء والصفات) بەسەنەدێکی صحیح لە لاپەڕە 486 بۆمان ڕیوایەت دەکات کە (عبدالله بن سلام) الله لێی ڕازی بێت کە یەکێک بوو لەو

هاوەڵانەی مژدەی بەهەشتی پێدرابوو دەفەرموویت : (ان الله عز وجل ابتدا الخلق وخلق الارضين في يوم الاحد والاثنين وخلق السموات يوم الخميس) واتە : (الله عز وجل زەویەکانی دەستی کردووە بە دروستکردنی زەویەکان لە ڕۆژی یەکشەممە و دووشەممە وە ئاسمانەکانیش لەڕۆژی پێنج شەممە) ووشەیەکی نامۆت بینی ؟ ووشەی (الارضين) واتە (زەوییەکان) ، دێینە سەر ئەم باسە لەبەشکانی تردا ، بەڵام لێرە ئەمەوێ ئەو تێبینیەتان پێ بڵێم کە ئەمە شێواز و کات و چۆنیەتی دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوییە لەشەرعی ئێمەدا بە شەش ڕۆژ بەشێوازێکی ڕێک و پێک و جوان و نەخشاو درووست بوون نەك بە تەقینەوە وەك تیۆرییە نامەعقولەکەی ناویان ناوە (Big Bang) کە دەیەوێت پێت بڵێ تۆ بێنرخیت و لەهیچەوە هاتوویتە بوون و گەردوون لەتەقینەوەیەکە و لەخۆوە درووست بووە ، ئەوە جێی داخە هەیە ئایەتی قورئان دائەتاشێت ئەڵێت ئایەتمان لەسەر بیگ بانگ هەیە ! سبحان الله لەو درۆ کردنە بەناوی قورئانەوە ، باسی ئەم ئایەتە دەکەن لەسورەتی (الانبياء) : (أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ) واتە : (ئایا کافران نابینن و بیرناکەنەوە کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەرەتادا یەك پارچەیەك بوونە پاشان خوای گەورە لێکی جیا کردونەتەوە وای لە ئاسمان کردووە باران ببارێنێتو وای لە زەوی کردووە رووەك بڕوێنێت کە پێشتر وا نەبوونە وە لە ئاویش هەموو شتێکمان زیندوو کردووەو دروست کردووە وەکو ئاژەڵەکان ڕووەکەکان وە ئاو هۆکاری ژیانی هەموو زیندەوەرێکە ئەی ئیتر بۆ ئیمان ناهێنن بە خوای گەورە) جا ئەڵێن ئەوەتا ئەڵێ ئاسمانەکان و زەوی پێکەوەنوسابوون ئەو تیۆریەش ئەڵێ سەرەتا گەردوون هەمووی یەک بووە پاشان تەقی وەتەوە ، جارێ پێشەکی بیگ بانگ ملیاران ملیار ساڵی پێچووە بەڵام زەوی و ئاسمانەکانی ئێمە بە شەش ڕۆژ درووستبووە ، ئنجا ئایەتەکە دەڵێت ئاسمانەکان و زەوی پێکەوە لکابوون نەیوتووە گەردوون تۆپەڵێک بووە پاشان تەقیوەتەوە ئەڵێ (ففتقناهما . جیامان کردنەوە) نەک (ففجرناهما . تەقاندمانەوە) ، بەڵێ سەرەتا زەوی درووستکرا و لەگەڵ ئاسمان پێکەوە لکابوون پاشان زەوی جیابۆیەوە لەئاسمان و زەوی بۆیە حەوت چین و ئاسمانیش حەوت چین ، ئەوەتا ئیمامی (القرطبي) لەتەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت : (قال ابن عباس والحسن و عطاء والضحاك وقتادة يعني أنها كانت شيئا واحدا ملتزقتين ففصل الله بينهما بالهواء ، وكذلك قال كعب خلق الله السماوات والارض بعضها على بعض ثم خلق ريحا بوسطها ففتحها بها وجعل السماوات سبعا والارضين سبعا ، وقول ثان قاله مجاهد والسدي

وأبو صالح كانت السماوات مؤتلفة طبقة واحدة ففتقها فجعلها سبع سماوات وكذلك الارضين كانت مرتتقة طبقة واحدة ففتقها فجعلها سبعا ، وحكاه القتبي في عيون الاخبار عن إسماعيل بن أبي خالد قال : كانت السماء مخلوقة
وحدها والارض مخلوقة وحدها ، ففتق من هذه سبع سماوات ، ومن هذه سبع أرضين ) واته : (ابن عباس و حەسەن و عطاء و ضحاك و قەتتادە دەڵێن واتە ئاسمان و زەوی یەك پارچەبوون پاشان الله جیاوازی خستە نێوانیان بە هەوا ، وە کەعب دەڵێت الله ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد یەک لەسەر یەک پاشان بایەکی ناردە نێوەندەکەیان و نێوەندەکەی کردەوە ئاسمان بووە حەوت و زەویش حەوت ، وە ووتەی دووەم لە موجاهید و سوددی و ابوصالح هاتووە دەڵێن ئاسمانەکان سەرەتا یەک چین بوون و کرانەوە بوونە حەوت وە زەویش یەک چین بوون کرانەوە بوونە حەوت ، وە قوتبی لە (عیون الاخبار) دەیگێڕێتەوە لە اسماعیل بن ابي خالد وتوویەتی : ئاسمان یەک پارچە بوو زەویش هەروەها جا لەو پارچە ئاسمانەوە بووە حەوت و لەو پارچە زەویەشەوە بووە حەوت) ئەمە تەفسیری ئەهلی علم و سەلەفی صالحە ، دووبارە بینەری ووشەی (الارضين) بوون واتە زەوییەکان یان (سبع الارضين) واتە حەوت زەوییەکە ، بۆ ئەوەی چاوەڕوان نەبیت لەزانینی ئەم نهێنیە نەزانراوە دەست دەکەم بە باسکردنی ئەم باسە وردە وردە ان شاءالله تا زیاتر تێ بفکریت لە دروستکراوەکانی الله .

## زەوی فراوان و گەورەیە وە حەوت چینە بە وێنەی ئاسمانەکان وە بوونەوەری دیکەی لەسەردەژیت (الله اعلم)

لەوانەیە تا ئێستا تۆ تەنها (حەوت چینی ئاسمان) ت بیستبێت ، دەی لەمەودوا بزانە کە بەوێنەی ئەوان حەوت چین زەویش بوونی هەیە ، الله سبحانە وتعلى لەسورەتی (الطلاق) ئایەتی کۆتایی ئاماژە بەمە دەکات و دەفەرمووێت : (اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا) واتە : (خوای گەورە ئەو خوایەیە کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە وە لە زەویش هاوشێوەیان واتە حەوت زەویشی دروست کردووە وەکو لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەریشدا هاتووە ئەمرو فەرمانی خوای گەورە دائەبەزێ لە نێوان هەر حەوت ئاسمان و هەر حەوت زەویەکە تا بزانن خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە وە بە دڵنیایی زانست و زانیاری خوای گەورە دەوری هەموو شتێکی داوەو هیچ شتێك نیە کە

خوای گەورە زانیاری پێ نەبێ و ئاگای لێ نەبێت) [تەفسیری ڕێبەر] وەك دیارە باس لەوە دەكات حەوت چینی ئاسمان درووستكردووە پاشان دەفەرمووێت وە زەویش (مثلهن) واتە هاوشێوەی ئەو حەوت چین ئاسمانە ، وە وەك لە صحیحی بوخاری هاتووە بەژمارە 2454 پێغەمبەری خوا (صل الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (من اخذ شیئا بغیر حقه فخسف به یوم القیامة الی سبع أرضین) واتە : (هەركەس شتێك بەناحەق زەوت بكات لەڕۆژی قیامەت ڕۆ دەچێت بە ناخی حەوت زەوییەكەدا) ، ئێستا ئەوەی پێویستە بزانین ئایا ئەم حەوت زەوییە لەكوێن ، بێگومان ڕوونە لە بنی زەوییەكەی خۆماندا وەك لە حەدیثەكە دیارە دەڵێت (خسف) واتە ڕۆ دەچێت ، وە ئاسمانەكان بەسەر یەكەوەن وە زەوییەكانیش دیارە بە ژێر یەكەوەن ، وە بەڵگەی ڕوونمان هەیە لەسەری وەلەو بابەتەكە خۆی بەڵگە نەویستە ، بەڵام بۆ بەهێزكردنی بابەتەكە بەڵگەی دیكە دەهێنینەوە ، لەوانەش ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوایە كە باس لە (سجین) دەكات ، (سجین) ئەو شووێنەیە كە نامەی كردەوەكانی بێباوەڕان بۆی دەچێت وەك لەسورەتی (مطففین) باسی لێ كراوە ، جا پێغەمبەر سەبارەت بە نامەی كردەوەی بێباوەڕەكان دەفەرمووێت : (اطرح الله كتابهم في سجين في الارض سابعة سفلى) واتە : (الله نامەكانیان ڕەت دەكاتەوە بۆ زەوی حەوتەمی خوارەوە) ئەم حەدیثە صحیحە ئیمامی ابوداود ڕیوایەتی كردووە (4753) وە احمد ڕیوایەتی كردووە (18557) وە ابن ماجه (1549) وە النسائي (2001) ، لە پاش جەمعی ادلة (كۆكردنەوەی بەڵگەكان) زانایان گەیشتوون بەوەی كە ئەم زەویيانە چین چینن و هەر چینێک بۆ چینەكەی تر هێندەی ئاسمان بۆ ئاسمانێكی ترە ، هەر چینێكیش الله خۆی زانایا چی تێدا درووست كردووە ، ئەم قسەیەش بەدی دەكەین لە تەفسیرەكەی ئیمامی (القرطبي) جوزئی كۆتایی پەڕەی 64 وە كتێبی (النكت و العيون) ی ئیمامی (الماوردي) جوزئی 5 پەڕەی 36 كە هەردووكیان دەڵێن : (واختلف فيهن على قولين ، أحدهما : قول الجمهور أنها سبع أرضين طباقا بعضها فوق بعض ، بين كل أرض وأرض مسافة كما بين السماء والسماء ، وفي كل أرض سكان من خلق الله) واتە : (لەسەر شێوازی ئەم زەویيانە دوو ڕەئیمان هەیە ، یەكەمیان : ووتەی زۆرینەیە كە حەوت زەوی چین لەسەر چینن و نێوانی هەر زەوییەک بۆ ئەوی دی هێندەی ئاسمانە بۆ ئاسمانێكی دی ، وە هەر زەوییەك كۆمەڵێك لەدرووستكراوەكانی اللهی لێیە) ، جا لەوەیە بڵێی ئەی ئایا ڕەئی دووەم چیە ، ڕەئی دووەم شۆكت دەكات ، دەڵێت : (قول ثاني حكاه الكلبي عن أبي صالح عن ابن عباس أنها سبع أرضين منبسطة ليس بعضها فوق بعض ، تفرق بينها البحار ، فعلى هذا إن لم يكن لأحد من أهل

الارض وصول إلى أرض أخرى اختصت دعوة الاسلام بأهل هذه الارض) واتە : (ڕەئی دووەم کەلبی لە ابوصالح دەگێڕێتەوە ئەویش لە ابن عباس کە وتوویەتی ئەم حەوت زەویە یەک لەسەر یەک نین بەڵکوو حەوت زەوی تەختن ، نێوانیان دەریایە و کەس ناتوانێ لەم زەویە بڕوات بۆ زەوییەکەی تر ، وە بانگەوازی ئیسلام تایبەتە بەم زەویە) سەبارەت بەم ڕەئییە ڕەئییەکی لاوازە ، یەکەم لەبەر ئەوەی پێچەوانی سەرڕیحی فەرموودەیە کە ئاماژەیە بۆ چین چین بوونی زەوییەکان ، دووەمیش کەلبی کە گێڕاوییەتیەوە زانایان فەرموودەیان بە ضعیف داناوە ، بەڵام لەشووێنێکی تر ڕیوایەتێکی ترمان هەیە کە صحیحە هەر لە ابن عباسەوە کە ئیمامی (نعیم بن حماد) ڕیوایەتی دەکات بە ژمارە 1657 کە ابن عباس فەرموویەتی : (الارض سبعة أجزاء فستة أجزاء منه ياجوج وماجوج وجزء فيه سائر الخلق) واتە : (زەوی حەوت بەشە ، شەشیان یەئجوج و مەئجوجی لێیە بەشەکەی تریش بوونەوەرەکانی تر) دەشێت ئەو حەدیثەی سەرەوە کە هێنامانەوە هەر مەبەستی ئەوەبێت کە زەوی حەوت بەشە واتە ئەم زەوییەی خۆمان نەک مەبەستی ئەوە بێت ئەو حەوت زەوییەی قورئان و سوننەت باسیان کردووە چین چین نەبێت ، جا لێرە باسی یەئجوج و مەئجوج هاتە گۆڕێ کە دەتوانین بڵێین یەئجوج و مەئجوج بەهێزترین بەڵگەن لەسەر فراوانی زەوی ، ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە 3348 کە پێغەمبەری خوا (صل الله عليه وسلم) فەرموویەتی کە یەک پیاو لە ئێوە بەرامبەر هەزار دانەیە لە یەئجوج و مەئجوج ، یانی ڕێژەیان زۆر زۆرە ، ئەم ڕێژەیە زۆرە جێگەی دەبێتەوە لەسەر ئەم زەویە گۆییە بچوکە کە گوایە تەواوی جێگەکانی ئاشکراکراوە لەڕێگەی سەتەلایتەکانەوە ، وە ئیمامی ابن ماجە ڕیوایەتی دەکات بە سەنەدێکی صحیح ژمارە 3310 کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی کە ئەو کاتەی یەئجوج و مەئجوج دەرەچن کۆمەڵی یەکەمیان دەگەنە سەر دەریاچەی (الطبرية) و ئاو دەخۆنەوە و دەڕۆن دوایی کۆمەڵێ دواتر ئەگەن سێرەکەن دەریاچەکە ئاوی تێدانەماوە ، واتە هێندە زۆرن ، ئەی کوان لەکوێن ئێستا ؟ هەر لە حەدیثێکی دیکەی صحیح کە ابن ماجە ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە 3314 کە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت هەتا ئەو ڕۆژەی بەنداوەکە دەشکێنن (ئەو بەنداوەی ذوالقرنین بۆی درووست کردوون وەك سورەتی کەهف باسی دەکات) هەموو ڕۆژێک خەریکن بیشکێنن جا کە کاتی خۆرئاوابوون دێت دەس هەڵدەگرن دەڵێن بۆ سبەینێ ، سبەینێ دێنەوە وەک خۆی لێ هاتۆتەوە بەنداوەکە

جا لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت بەنداوەکە زۆر گەورەیە وا بەو هەموو کەسەوە پێیان ناشکێت

، کوا بەنداوەکە لەکوێیە ؟ ئەی ئایا زەوی بچوك نیە ؟ هەموو جێگاکانی سەر گۆی زەوی ئاشکرا و زانراو نیە ؟ ئەگەر زۆر ووردببینەوە لە و ئاثار و شووێنەوارانەی بۆمان ماوەتەوە لە سەلەف (الله لێیان ڕازی بێت) شتی زۆر سەیر و سەمەرە بەدی دەکەین کە کەس تا ئێستا پەی پێ نەبردووە ، بەنموونە فەرموودەیەك کە ئیمامی (حاکم) لە (مستدرك) جوزئی 4 پەڕەی 501 ڕیوایەتی دەکات و دەڵێت (حدیث صحیح على شرط الشیخین) واتە : (فەرموودەکە صحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم) کە حەدیثەکە ووتەی (عبداللەی کوڕی ئیمامی عومەر) ە خودا لەخۆی و باوکی ڕازی بێت فەرموویەتی : (من وراء یاجوج وماجوج ثلاث أمم ما یعلم عدتهم إلا الله منسك وتاویل وتاریس) دەفەرمووێت : (لە پشتی یەئجوج و مەئجوجەوە سێ ئوممەتی تر هەن بەس الله ژمارەیان دەزانێت بریتین لە مونسیك و تاویل و تاریس) ، ئەمە قسەی صەحابیەکە وە بابەتەکە غەیبیە و سەنەدەکەی درووستە و ووتەی ئەوە ، جا چونکە بابەتەکە غەیبیە ئەگەر ئێمە بە ناڕاستی بزانین ئەوا وا گوومانمان بردووە صەحابیەك لەخۆوە قسەی لەغەیبدا کردووە ، ئەمەش گوومانی خراپە ، بەڵکوو بەڵێ پشت ڕاستی دەکەینەوە ئەوە ووتەی ئەوە دەشێت لە پێغەمبەری خوای گووێ لێ بووبێت بەس قسەکانی باش بیر نەمابێت نەیوێراوە بیداتە پاڵ پێغەمبەری خوا (الله اعلم) بە درۆی ناخەینەوە و دەوەستین لەسەری ، خوا خۆی زاناترە و باشتر دەزانێت .

## شاخی قاف بەدەوری زەویدا

یەکێك لە سورەتەکانی قورئان بریتیە لە سورەتی (ق) کە یەکەم ئایەت لە سورەتەکە بەو پیتە دەست پێدەکات ، جا زانایانی بواری زانستەکانی قورئان دەفەرموون کە بەس الله خۆی عالمە چ نهێنیەك و چ واتایەک هەیە لەپشتی ئەم حروفە متقطعانەی قورئان وەك : (ص . ق . ن . الم . حم ...) بەڵام ئەگەر بڕوانینە تەفسیرەکان هەندێك جار دەبینین سەلەف لەبارەی ئەو حروفانەوە کۆمەڵێك قسەیان کردووە ، جا یەکێك لەو حروفانەی سەلەف قسەیان لەبارەوە کردووە ئەو حەرفی (قافەی) ەی سورەتی (ق) ە ، جا بزانین چیان لەبارەوەی وتووە ، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تەفسیری عولەما ، لەتەواوی تەفسیرەکانی وەك : (الطبري و البغوي و القرطبي و ابن كثير و ... هتد) بەدی دەکەین لەتەفسیری ئەم ئایەتە ووتەیەك دەهێنن و دەیدەنە پاڵ سەلەف ئەویش ئەوەیە کە (ق . قاف) شاخێکە لەماددەی زومرودی سەوز الله خەلقی کردووە و دەوری زەوی داوە ، بە نموونە ئیمامی (الطبري) کە خاوەنی یەکەمین و بەهێزترین تەفسیرە

کە تەفسیری ئایەتی بە ووتەکانی سەلەف کردبێت لەتەفسیری ئەم ئایەتە لە (جامع البیان) دەڵێت : (قال بعضهم إسم من الاسماء القرآن وقال الاخرون إسم الجبل محیط بالارض) واتە : (هەندێکیان دەڵێن ناوێکە لەناوەکانی قورئان ئەوانی دیکەش دەڵێن ناوی شاخێکە دەوری زەوی داوە) ، وە ئیمامی (الطبراني) لە تەفسیرەکەی خۆی (تفسیر الکبیر) لەتەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت : (قال عکرمة وضحاك وجماعة المفسرین بان هو إسم جبل محیط بالدنیا من زبرجد أخضر أخضرت السماء منه) واتە : (عکرمە و ضحاك و کۆمەڵێك لە موفەسسیرین دەڵێن ناوی شاخێکە دەوری دوونیای داوە لە زەبەرجەدی سەورە (تێبینی : زەبەرجەد هەر زومرودە) کە بەهۆی سەوزی شاخەکەوە ئاسمانەکەی سەریشی سەوز بووە) وە ئیمامی (القرطبي) لەتەفسیری ئایەتەکە دەڵێت : (قال إبن زید وعکرمة وضحاك : هو جبل محیط بالارض من زمردة الخضراء اخضرت السماء منه) واتە : (ابن زید و عکرمة و ضحاك دەڵێن : شاخێکە دەوری زەوی داوە لە زومرودی سەوزە ئاسمانیشی بەخۆیەوە سەوز کردووە) ، جگە لەمانیش گەر بڕوانیتە تەفسیرەکان ئەو ڕەئییەمان لەسەلەفەوە بۆ دەهێنن ، بەڵام ئەمڕۆ ئەگەر سێربکەین ئەونەی لە زانایان پرسیارکرابێت وتوویانە ئەو ڕیوایەتانە ئیسرائیلیاتن ، ئیسرائیلیات واتە بابەتەکە لە بەنو ئیسرائیل بیستراوە ئەوانیش وایان گێڕاوەتەوە ، هەر لەسەر ئەمەش شێخ (ابن کثیر) لەتەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت : (وقد روي عن بعض السلف انهم قالوا (ق) جبل محیط بجمیع الارض ، یقال لە جبل قاف وکأن هذا (والله اعلم) من الاسرائیلیات) واتە : (لە هەندێك لەسەلەف ڕیوایەت کراوە سەبارەت بە (ق) وتوویانە شاخێک هەیە دەوری تەواوی زەوی داوە پێی دەگوترێت قاف ، بەس خودا زاناترە وادیارە ئیسرائیلیاتە ئەم قسەیە) ، جا ئێمە لەم باسەدا نە پشت ڕاستی دەکەینەوە نە بەدرۆی دەخەینەوە ، چونکە مەعلومە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی (حدثوا عن بني اسرائیل ولا حرج) واتە : (بگێڕنەوە لە بەنو ئیسرائیل کێشەی تێدانیە) ئەم حەدیثە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە بەژمارە 3461 ، وە هەروەها زانایان وتوویانە ئەو فەرموودانەی زانرا ئیسرائیلیاتن ئەوا دەبنە سێ دانە لقەوە:

1. لقێکیان ڕەد دەکرێتەوە ، ئەوەیانە کە موخالفی دەقی قورئان یان حەدیثە .
2. لقێکیان وەردەگیرێت ، کە لەقورئان هەمان دەق یان حەدیث هەمان دەق هاتووە .
3. لقێکیان نە بە درۆ دەخرێتەوە نە پشت ڕاست دەکرێتەوە ، ئەویش ئەوەیانە کە ئەو ووتەیە نە لەقورئان هاتووە نە لە سوننەت ، وە قسەکەش پشت ڕاست کراوەتەوە بەسەنەد کە

وترابێت .
جا دیارە ئەم باسە لە جۆری سێیەمە ، دەقێکی ڕوونی قورئان و سوننەتی لەسەر نیە بەدرۆی بخاتەوە یان پشت ڕاستی بکاتەوە ، بۆیە لەسەری دەوەستین و نە باوەڕی پێ دێنین نە بەدرۆی دەخەینەوە ، بەڵام ئەوەندە دەڵێین ڕەئیەکی زۆری لەسەرە لەسەلەفەوە تەنانەت (ابو الحسن الواحدي) لە تەفسیری (الوجیز) سەبارەت بەئایەتەکە دەڵێت : (إختلفوا في تاويله فأكثر المفسرين قالوا إنه جبل محيط بالدنيا من زبرجد وهذا قول مقاتل وعبدالله بن بريدة وعكرمة وضحاك ومجاهد وعطاء ورواية عطاء وأبي الجوزاء عن إبن عباس) واتە : (ڕاجیایی هەبووە لەسەر تەئویلەکەی ، زۆرینەی موفەسسیرین دەڵێن شاخێکە دەوری دوونیای داوە لە زەبەرجەد درووستکراوە ئەمەش قسەی موقاتیل و عبداللە بن بورەیدە و عیکریمە و ضحاك و موجاهیدە وە عطاء و ابي الجوزاء ڕیوایەتی کردووە لە ابن عباس) هەروەها باسەکە لە جگە لەلای موفەسسیرینیش هاتووە بە نموونە ئیمامی (إبن مفلح الحنبلي) دەڵێت (المبدع شرح المقنع) جوزئی 1 پەڕەی 16 دەڵێت : (أعظم خلق الله جبل قاف وقال المفسرون : هو جبل أخضر من زبرجد الخضراء ومنها خضرة السماء محيط بالدنيا كاحاطة البياض العين بالسوادها) واتە : (گەورەترین درووستکراوی الله شاخی قافە و موفەسسیرین دەڵێن : شاخێکی سەوزە لە زەبەرجەدی سەوز و ئاسمانی سەر خۆی سەوز کردووە و دەوری دوونیای داوە وەک دەورەدانی سپیایی چاو بە ڕەشێنەکەی) ، جا مەبەستم لە هێنانەوەی ئەم قسانە ئەوەیە ئەم زانا بەڕێزانە نزیکتر بوون لە سەردەمی سەلەف دیاربووە شتێکیان لەو بارەیەوە زانیوە بەڵام وردە وردە کە بیرۆکەی گۆیی بوونی زەوی تەشەنەی سەند لەوڵاتی مسوڵمانان وردە وردە بابەتەکە کاڵ بووەیەوە و وای لە خەڵك کرد وەك خوڕافاتێک سەیری باسەکە بکات ، یاخوود سەنەدی ئەو ئەثەرانە بە لاواز بزانێت لەکاتێکدا ئیش بە فەرموودەی لاواز دەکرێت ئیللا مەگەر پێچەوانەی لەگەڵ بیروباوەڕ و دەقی ڕوونی قورئان یان فەرموودەیەکی تری صحیح هەبێت ،
حەدیثێکی ترمان هەیە (ابو شیخ) لە (العظمة) ڕیوایەتی دەکات بەژمارە 982 حەدیثەکە لە ابن عباس ـەوە ڕەزاو ڕەحمەتی الله لێبێت فەرموویەتی : (دخل علينا رسول الله صل الله عليه وسلم ونحن في المسجد حلق حلق ، فقال لنا رسول الله صل الله عليه وسلم : فيم انتم ؟ قلنا : نتفكر في الشمس كيف طلعت وكيف غربت ، قال : احسنتم كونوا هكذا تفكروا في المخلوق ، ولاتفكروا في الخالق ، فان الله عز وجل خلق ما شاء لما شاء ، وتعجبون من ذلك ؟ ان من وراء

(ق) سبع بحار ، كل بحر خمس مائة عام ومن وراء ذلك سبع ارضين ....) حەدیثەکە مەتنەکەی درێژە بەس من ئەونەییم پێویست بوو هێنام ، واتە : (ابن عباس دەڵێت دانیشتبووین لە مزگەوت بازنە بازنە و پێغەمبەری خوا صل الله علیه وسلم هات فەرمووی چیەکەن ئێوە ، ئێمەش وتمان بیر لە خۆر دەکەینەوە چۆن هەڵدێت و چۆن ئاوادەبێت ، ئەویش فەرمووی ئافەرین بیر لە درووستکراوەکان بکەنەوە نەک درووستکەر ، الله ویستی لە چی بووبێت درووستی کردووە ئایا سەرتان لەمە سوڕماوە ؟ لە پشتی (قاف) حەوت دەریا هەیە پانتایی هەریەکەیان پێنجسەد ساڵە و بەدەوری هەر دەریایەک زەویەکە واتە حەوت زەوی ....)
ئەم حەدیثە سەنەدەکەی پێنج کەسی تێدایە تا دەگاتەوە ابن عباس لەو پێنج کەسە چواریان مەعروفن و فەرموودەیان لێ قبووڵ دەکرێت بریتین لە :

1. علي بن عمرو ، کە ابو شیخ خۆی لە حەدیثی ژمارە 377 لە (العظمة) دەڵێت پێی " صدوق " واتە ڕاستگۆیە .
2. ابوالطیب احمد بن روح ، کە ابو شیخ لە کتێبی (طبقات المحدثین باصبهان والواردین علیها) بە ژمارە (61) باسی دەکات و دەڵێت " مقبول " واتە " قبوڵ کراوە " .
3. مقاتل بن حیان و عکرمة ، گوومان لە زوهد و ساڵحی ئەم دوو تابیعیە بەڕێزانە نیە و لای تەواوی زانایانی جەرح و تەعدیل قبوڵن و هەردووکیان خوێندکاری ابن عباسن .

ئەو کەسەی ماوە بریتیە لە (ابراهیم بن موسی البحراني) ئەم ئەم کەسە مجهول حالە (نەناسراوە) زانایان نە بەدرۆزن ناویانی هێناوە نە بەڕاستگۆ چونکە ناسیاونین ، جا بەم هۆیە حەدیثەکە بە لاواز دانراوە ، بەڵام ئەگەر لێی بکۆڵینەوە ئەم کەسە خوێندکاری (مقاتل بن حیان) ی خوێندکاری (ابن عباس) ە وە مامۆستای (علي بن عمرو) ە کە ئەو کەسێکی ڕاستگۆیە و فەرموودەی لێ وەرگیراوە ، ئەم زانیاریانە زۆر ئاسان بەدەست دێن ئەگەر ناتوانن کتێبەکانی حدیث بگەڕێن هەر ئەو ناوانەی وتوومە بەس ناوەکان لە گوگڵ بنووسن خۆی ئۆتۆماتیکی بۆت دەهێنێت زانیایەکانی سەری کە لە کتێبەکانی حەدیثدا هاتوون ، کەوایە ئەم حەدیثەی سەرێ لاوازیەکەی زۆر کەمە سەنەدەکەی یەک نەفەری نەناسراوی تێدایە ئەویش کە نەناسراوبوو مانای وانیە درۆزن بێت بەڵکو گوومانەکان بەلای ڕاستگۆیی ئەودا دەمان بەم بەهۆی یەکێک لەخوێندکارەکانی و وە مامۆستاکەی ، وە فەرموودەی لاوازیش مانای وانیە پەندی تێدانەبێت نەخێر ئەوەی پێی وایە فەرموودەی لاواز هیچ کات کاری پێناکرێت ئەوا بەهەڵەدا چووە ، بەڵکوو ئەوە حەدیثی باطل و منكر و موضوع ە کە ئەبەدەن ئیشی پێ

ناکرێت ، وە خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە هیچ نەبێت فەرموودەیەکی لاواز لەبەردەستە زەوی گۆیی بخاتە ژێر پرسیارەوە (سەرەڕای ئەوەی ووتمان لاوازیەکەی زۆر کەمە) ، وە ئەو ئەثەرانەی پێشوو کە لە سەلەف گێڕدراونەتەوە هەمووی بەرەو گوومانی ڕاست بوونی ئەم بابەتە دەمانبەن ، ئەوەشمان بیرنەچێت زانا جوگرافیناسە کۆنەکانیش بێ بەش نەبوون لەباسکردنی ئەم باسە ، دوو دانەیان بە نموونە وەردەگرم و باسیان لێوە دەکەم :

1.عمر بن الوردي ، جوگرافیناسی سەدەی شەشەمی کۆچی لە (خريدة العجائب و فريدة الغرائب) پەڕەی 167 دەڵێت : (فاعظم الجبال الدنيا قاف وهو محيط بها كاحاطة البياض العين بسوادها وقال البعض المفسرين إن الله سبحانه وتعلى خلق من وراء جبل قاف أرضا بيضاء كالفضة الجلية) واتە : (گەورەترین شاخی دوونیا بریتیەلە قاف کە دەوری داوە وەک دەورەی سپێنەی چاو بە ڕەشێنەکەی ، وە بەشێکی موفەسسیرین دەڵێن لەدەوربەری قاف زەویەکی زیوی بوونی هەیە بەوێنەی زیوی پاڵفتە) .

2.زكريا بن محمود القزويني ، لە کتێبی (عجائب المخلوقات وغرائب الموجودات) پەڕەی 151 باس لە شاخ و کێوەکانیسەر زەوی دەکات و بە شاخی قاف دەست پێدەکات و دەڵێت : (جبل قاف قال المفسرون جبل محيط بالدنيا وهو من زبرجدة الخضراء منه خضرة السماء ووراءه عالم وخلائق لا يعلمه الا اللهسبحانه وتعلى) واتە : (شاخی قاف موفەسسیرین دەڵێن شاخێکە دەوری دوونیای داوە و لە زەبەرجەدی سەوزە و ئاسمانەکەی سەرو خۆی سەوز کردووە و لەدەوریدا جیهان و درووستکراوانێک هەن کەس نایزانێت الله نەبێت) .

لەوە زیاتر درێژە بەم باسە نادەم و بەڵگەکان ڕوون و ئاشکران ، الله اعلم .

## بۆتان دەدووێم لەبارەی خۆر و مانگ و هەسارەکان و ئەستێرەکان

قسەمان کرد لەبارەی ئاسمانەکان ، کە حەوت چینن و یەک لەسەر یەکن ، ئەوەی ماوە بدووێم لەسەری ئەوەیە باسی ئەو درۆیە بکەم کە گوایە ئاسمان بۆشاییە ، نەخێر شتێک نیە بە بەناوی بۆشایی ، بەڵکو ئاسمان ماددەیە و هەستی پێدەکرێت وە ئایا نێوان ئاسمانەکان چیە الله اعلم هەوا بێت یان هەر شتێک کە الله خۆی دەزانێت ، چۆن بە ئاسمان بڵێین بۆشایی لە کاتێکدا الله جل جلاله لەسورەتی (الحج) ئایەتی 65 دەفەرمووێت : (وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ ۗ ) واتە : (وە ئاسمانی ڕاگرتووە نایەڵێت بەربێتەوەو بکەوێ بەسەر زەویدا ئیلا مەگەر بە ئیزنی خوای گەورە) باشە ئەگەر ئاسمان ماددە نەبێت

چۆن بەردەبێتەوە بەسەر زەویدا ؟ بۆشایی بەردەبێتەوە ؟ .. وەسەبارەت خۆر و مانگ و هەسارەکان و ئەستێرەکان کۆمەڵێکن لە درووستکراوەکانی اللە کە لەئاسماندا فەراهەمی هێناون و هەریەکەیان دابین کراون بەشێوازێک لەشێوازەکان بۆ خزمەتکردنی بەندەکانی اللە لەسەر زەوی ، وەک زاتی اللە خۆیان دەفەرموون : (وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ) واتە : (وە خوای گەورە شەو و ڕۆژو خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی بۆ ژێربار کردووەن و لە ژێر فەرمانی خوای گەورەدان بە گوێرەی بەرژەوەندی ئێوە دێن و ئەڕۆن بە دڵنیایی هەموو ئەم دروستکراوە گەورانەی خوای گەورە نیشانەن لەسەر دەسەڵات و گەورەیی‌و تاك‌و تەنهایی خوای گەورە کە تاك و تەنهاو بێ شەریکە بەڵام بۆ کەسانێك کە عەقڵیان هەبێت و بیربکەنەوە) بێگوومان هەریەکەیان بەپێی بەرژەوەندی ئێمە ژێربارکراون بەفەرمانێکی دیاریکراو و هەموویان لەدوای درووستکردنی ئاسمانەکان اللە ئەوانی درووستکردووە و خولگە و ڕێچکە و ڕێڕەو و فەرمانی بۆ هەریەکەیان دیاریکردووە ، جا خۆر و مانگی کردۆتە نیشانە بۆ شەو و ڕۆژ و کردوویەتیە هۆکار بۆ ئێمە تاوەکو بەرواری ڕۆژ و مانگ و ساڵی پێ دیاری بکەین وەک دەفەرمووێت : (وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا) واتە : (وە ئێمە شەو و ڕۆژمان داناوە کە دوو نیشانەن وە نیشانەکەی شەومان سڕیوەتەوە و کوژاندۆتەوە کە مانگە بەڵام نیشانەکەی ڕۆژ بینراوە کە خۆرە و بەڕۆژ ڕووناکە تا بەهۆی ڕووناکی ڕۆژەوە بە دوای بژێوی ژیانتاندا بگەڕێن وە بەهۆی تاریکی شەوەوە پشووی تیا بدەن ، وە تا بەهۆی شەو و ڕۆژو مانگ و خۆرەوە ژمارە و حساب و مێژووی خۆتان بزانن وە ئێمە درێژەمان بە هەموو شتێك داوەو ڕوونمان کردۆتەوە) وە هەریەکەیان لەو خولگەیەی بۆی دیاریکراوە بە هەژمارێکی ورد و درشت دێت و دەچێت وەک لە ئایەتەکانی پێشوودا خسمانە ڕوو ، وە هیچ کامیان لە زەوی گەورەتر نین بەبەڵگەی ئەوەی زەوی لەپێش ئاسمانەکان و ئەوەشی تێیدایە درووستکراوە وە هەروەها بەبەڵگەی ئەوەی؟تا ئێستا بە جگە لە وێنەی درۆیینە نەسەلماوە خۆر گەورەتر بێت لە زەوی ، وە بەبەڵگەی ئەم فەرموودە کە پێغەمبەری اللە دەفەرمووێت : (تدنى الشمس يوم القيامة من الخلق حتى تكون منهم كمقدار ميل) واتە : (خۆر لەڕۆژی قیامەت لەدرووستکراوەکان نزیک دەکرێتەوە و ئەندازەی میلێکی دەمێنێ لێیان بدات) ڕوونە قیامەتیش لەسەر زەوییە و جا گەر زەوی وەک دەنکێک تۆز وابێت لەچاو خۆر ئایا چۆن خۆر یەک میلی دەمێنێت تا لێی بدات ؟ میلێک

دەکاتە 1852 مەتر ، ئەم حەدیثەی ووتمان ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە (2864) جا کێ دەڵێت خۆر گەورەترە بابێت بیسەلمێنێت بزانین لە وێنە زیاتر هیچی تری پێیە ، وە هەریەك لەخۆر و مانگ ڕووناکیەکی تایبەت بەخۆیانیان هەیە ، ڕووناکی خۆر ڕووناکیەکی گەرمی سوتێنەر وە هی مانگ ڕووناکیەکی زیوی فێنک ، وەک الله دەفەرموویّت لە سورەتی (یونس) ئایەتی 5 : (هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) واتە : (خوای گەورە ئەو خوایەیە وای لە خۆر کردووە کە ڕووناك و گەرم بێت وە وای لە مانگ کردووە کە تەنها ڕووناك بێت وە ڕۆیشتنی مانگی تەقدیر کردووە پلە پلەیە هەر لە شەو و ڕۆژێکدا جووڵەیەك ئەکات سەرەتا بچوکە پاشان گەورە دەبێتو کامڵ دەبێت پاشان لە کۆتایی مانگدا کەم دەکاتەوە بۆ ئەوەی کە ئێوە بەهۆی خۆرەوە ژمارەی ڕۆژەکان بزانن وە بەهۆی مانگەوە ژمارەی مانگ و ساڵەکان و حسابی خۆتان بزانن خوای گەورە ئەم شتەی دروست نەکردووە تەنها بەحەق نەبێ وە ئایەتەکانی خۆی درێژە پێ ئەدات و ڕوونی ئەکاتەوە بۆ کەسانێك کە ئەم شتانە بزانن) واتە ڕووناکی خۆری ناوبردووە بە (ضياء) وە هی مانگیش بە (نور) ، وە هەرگیز ڕاست نیە دەگووترێت مانگ ڕووناکی لە خۆر وەردەگرێت بەڵکوو مانگ ڕووناکی تایبەتی خۆی هەیە ئەمەش بە چوار خاڵ دەسەلمێنین ، یەکەم ئاماژەمان پێدا کە (ضياء) جۆرێکە لەڕووناکی و (نور) جۆرێکە لە ڕووناکی جا لەم بارەیەوە شێخ (ابن رجب) لە کتێبی (جامع العلوم و الحكم في شرح خمسين حديثا) پەڕەی 245 دەڵێت : (والضياء هو النور الذي يحصل فيه نوع حرارة وإحراق كضياء الشمس بخالف القمر فإنه نور محض فيه إشراق بغير إحراق) واتە : (ضياء ڕووناکیەکە کە گەرمی دەر و سووتێنەرە وەک ڕووناکی خۆر کە پێچەوانەی مانگە کە ڕووناکیەکەی درەوشاوەیە و سووتێنەر نیە) ، وە دووەمیش بریتیە لە ووتەی الله کە دەفەرموویّت : (تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجًا وَقَمَرًا مُنِيرًا) واتە : (ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە ئاسمانەکاندا بورج و ئەستێرە گەورەکانی داناوە لە شوێنە بەرزەکاندا وە خۆری لە ئاسماندا داناوە کە گەرمیو ڕوناکی هەیە وە مانگی تیا داناوە کە ڕووناکی بەخشە) ئیمامی (ابن كثير) لەتەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت : (وقمرا منيرا أي مضيئا مشرقا بنور آخر ونوع فن آخر غير نور الشمس) واتە : (وقمرا منيرا واتە مانگ ڕووناکی دەبەخشێت بە ڕووناکیەکی تر و جۆرە هونەرێکی تر کە ڕووناکی خۆر نیە) ، بەڵگەکەی ترمان بریتیە لە ئایەتی 15 و 16 ی سورەتی (النوح) کە لەئایەتی پانزە دەفەرموویّت : (أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ

خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا) واته : (ئايا نابينن كه خوای گه‌وره حه‌وت ئاسمانی دروست كردووه چين له‌سه‌ر چين ئاسمان له‌سه‌ر ئاسمان وه ڕایگرتووه) پاشان ده‌فه‌رموویت : (وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا) واته : (وه مانگی تیایاندا گێڕاوه به ڕووناكی و خۆریش گێڕدراوه به چرایه‌ك) جا بڕوانين له‌باسی مانگدا ده‌فه‌رموویت گێڕدراوه به ڕووناكی (فيهن) ئێ (فيهن) واته (في السموات السبع) واته له ناو حه‌وت چينی ئاسمان گێڕدراوه به ڕووناكی چوونكه ئايه‌تی پێش خۆی باسی حه‌وت چينی ئاسمان ده‌كات ، كه‌واته مانگ ڕووناكيده‌ر بێت بۆ حه‌وت چينی ئاسمان كه‌وابوو هه‌ردوو ديوه‌كه‌ی ڕووناكيده‌ره ڕوويه‌كی ڕووی له‌زه‌وييه و ئه‌وی تر له‌ئاسمانه‌كان ئێ باشه تۆ بلێی ڕووناكی له خۆر وه‌رده‌گرێت كه‌واته ده‌بێت يه‌ك ڕووی ڕووناك بێت ، وه بۆ پشت ڕاست كردنه‌وه‌ی ئه‌مه دوو ئه‌ثه‌ری صحيحمان هه‌يه له هه‌ردوو صحابی به‌ڕێز (عبدالله بن عباس و عبدالله بن عمر) ڕه‌زاو ڕه‌حمه‌تی الله له‌هه‌ردووكيان بێت ڕيوايه‌ت كراوه ، يه‌كيان ئيمامی (حاكم) له (مستدرك) جوزئی 2 په‌ڕه‌ی 546 ڕيوايه‌تی ده‌كات به‌سه‌نه‌دی (صحيح على شرط شيخين) واته : (صحيح له‌سه‌ر مه‌رجی بوخاری و موسليم) كه عبدالله بن عباس فه‌رموويه‌تی : (القمر وجهه يضيء السموات وظهره يضيء الارض) واته : (مانگ ڕوويه‌كی ئاسمانه‌كان ڕووناك ده‌كاته‌وه ڕوويه‌كيشی زه‌وی) ئه‌وی ديكه ئيمامی (ابو شيخ) له (العظمة) به‌ژماره 615 به سه‌نه‌دی صحيح ڕيوايه‌تی ده‌كات له‌عبدالله بن عمر فه‌رموويه‌تی : (الشمس والقمر وجوههما الى السماء وقفاهما الى الاض يضيئان من في السماء كما يضيئان من في الارض) واته : (خۆر و مانگ ڕووييان له‌ئاسمانه و پشتيان له‌زه‌وييه و ئه‌وه‌ی له‌ئاسماندايه ڕووناكی ده‌كه‌نه‌وه چۆن ئه‌وه‌ی له‌زه‌ويدايه ڕووناكی ده‌كه‌نه‌وه) ، ئه‌مه‌ی ووتمان سه‌باره‌ت به خۆر و مانگ و ئه‌وه‌ی په‌يوه‌سته پێيانه‌وه ، ئێستا دێينه سه‌ر باسی ئه‌ستێره‌كان ، الله جل جلاله ده‌فه‌رموویت : (وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) واته : (وه خوای گه‌وره ئه‌و خوايه‌يه كه ئه‌ستێره‌كانيشی بۆ ئێوه دروست كردووه تا ڕێگای خۆتانی پێ بدۆزنه‌وه له تاريكيه‌كانی شه‌ودا له وشكانیو ده‌ريادا وه ئايه‌ته‌كانی خۆمان ڕوون كردۆته‌وه‌و درێژه‌مان پێداوه بۆ كه‌سانێك كه بزانن‌و زانياريان هه‌بێ) وه ئه‌وه‌ی گرنگه باسی لێوه‌بكه‌ين بريتيه له شيكردنه‌وه‌ی ئه‌ركی (هه‌ساره‌كان . الكواكب) وه وه‌ڵامی ئه‌و پرسياره‌ی كه ئايا زه‌وی هه‌ساره‌يه ؟ بێگوومان الله جل جلاله سه‌باره‌ت هه‌ساره‌كان ده‌فه‌رموویت : (إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ) واته : (ئێمه ئاسمانی دونيامان ڕازاندۆته‌وه به‌و هه‌ساره جوانانه) وه پاشان ده‌فه‌رموویت : (وَحِفْظًا

مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ مَارِدٍ) واتە : (وە بەو هەسارانە پاراستویشمانە لە هەموو شەیتانێکی سەرکەش‌و دەرچوو لە گوێڕایەڵی خوای گەورە کە بیانەوێت هەواڵی ئاسمان بدزن‌و بۆ فاڵچی‌و جادووگەرانی بێنن ئەوا بەو هەسارانە لێیان دەدرێت‌و دەسوتێنرێن) ووشەی (الكواكب) بە واتای هەسارەکان دێت ، کەوایە دوو ئەرکی هەسارەکانمان بۆ دەرکەوت لەم دوو ئایەتە : یەکەمینیان ئەوەیە ئاسمانی دوونیایان پێ ڕازێندراوەتەوە دووەمیشیان ئەوەیە لەڕێگەیەوە ئاسمانیان پێ دەپارێزرێن لە شەیطانەکان ، ئێستا دەپرسین ئایا زەوی ئەم دوو ئەرکەی هەیە ؟ نەخێر زەوی شووێنی ژیانە و لانکەیە بۆ دروستکراوەکانی الله وەك دەفەرمووێت : (الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) واتە : (ئەو خوایەی کە زەوی بۆ جێگیر کردوون‌و ڕاخستوون وەکو بێشکەیەك وە لە زەویشدا ڕێگای زۆری بۆ داناون تا تیایدا بێن‌و بڕۆن بەڵکو بەرژەوەندی خۆتان بدۆزنەوە وەکو ڕێنماییەك بۆتان) وە دەفەرمووێت : (وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ) واتە : (وە خوای گەورە زەویشی داناوەو ڕاخستووە بۆ مرۆڤەکان) کەوابوو زەوی لانکە و شووێنێکی ڕاخراوە الله بەدی هێناوە بۆ ژیان بەسەربردن تێیدا نەوەك هەسارە بێت ، هەر بۆیە ڕەحمەت بێت لە شێخ (التويجري) لە کتێبەکەی (صواعق الشديدة) پەڕەی 116 دەڵێت : (إطلاق إسم الكوكب للارض خطأ وضلال ولهذا القول أن تكون الارض الزينة التي زينا الله بها السماء الدنيا وجعلها رجوما للشياطين) واتە : (دەربڕینی ناوی هەسارە بۆ زەوی هەڵە و گومڕاییە جا بەو قسەیە بێت زەوی بەشێکە لەجوانکاری ئاسمان و بەشێکە لە ڕەجم کەری شەیتانەکان) وە شێخ (محمد بن يوسف الكافي) لە کتێبەکەی (مسائل الكافية) جوزئی 4 پەڕەی 578 دەڵێت : (من سماها الارض كوكبا كذب وافترى على الله تعلى لان الله تعلى الذي خلقها سماها ارضا) واتە : (ئەوەی ناوی زەوی نا هەسارە درۆ و بوهتانی بەدەم اللهوە کردووە چونکە الله کە درووستکەری زەوییە ناوی زەوی ناوە زەوی) جا زۆر عاقڵانە شێخ (الكافي) ئەم قسەیەی کردووە ، زەوی زەوییە و هەسارە هەسارەیە قورئان کاروبار و ئەرکی زەوی بەجیا باسکردووە و هی هەسارەش بەجیا هەرگیز پێک نایەت بڵێی هەسارەی زەوی ، وە هەروەها ئایەتێکی دیکەمان هەیە بەڵگەیە لەسەر هەسارەنەبوونی زەوی ئەویش ئایەتی:(وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انْتَثَرَتْ)

واتە : (وە کاتێك کە هەسارەکان بەر ئەبنەوە) مەبەستی قیامەتە کە بەردەبنەوە سەر زەوی ، ئەی گەر زەوی هەسارەیە ئەی زەوی خۆی بەردەبێتەوە کووێ ؟

## کۆتایی

بە فەزڵ و منەتی پەروەردگار و پاش سوپاس و ستایش و پێزانین بۆ الله عز و جل کە دەرفەتی پێدام بە نووسینی ئەم کتێبە و چاپکردنی بۆ بەر ڕۆژشنایی خوێنەران ، حەزم کرد تێبینیەکی گرنگ بۆ ئێوەی بەڕێز بخەمە ڕوو ئەویش بریتیە لەوەی کە دەزانم زۆربەی خوێنەران یاخود بڵێم هەموو خوێنەران چەندەها پرسیار و سەرنجیان بۆ درووست دەبێت لەسەر بابەتی زەوی تەخت و جێگیر ، لەو پرسیارانەش :

1.ئایا بۆچی تا ئێستا لێمان شاردراوەتەوە ؟

2.ئایا دیاردە سرووشتیەکان لەسەر زەوی تەخت چۆن ڕوودەدات بەنموونە خۆرگیران و مانگگیران یان هەڵکشان و داکشان؟

3.ئایا چی لەو یاسا فیزییانە دەکەن کە لەسەر بنەمای ئەو مۆدێلە دانراون ؟ وە چەندەها پرسیاری دیکە ، جا کتێبەکەی من باسکردنی بابەتەکە بوو لە تێڕوانین و دیدگای قورئان و سوننەتەوە ، وە تەواوی ئەم پرسیارانە وەڵامیان دراوەتەوە و بێ وەڵام نین زۆر دڵنیابن ، ان شاءالله لەگەڵ هەڵکەوتنی دەرفەت وردە وردە کتێبێک لەسەر ئەو بابەتە لەلایەنە زانستیەکەوەی ئامادە دەکرێت ، ئەویش نەک بۆ سەلماندنی بابەتەکە چونکە بابەتەکە قورئان و سوننەتی بەسە ، بەڵکوو بۆ بەرچاو ڕوونی خوێنەرە بەڕێزەکان ، وە دەتوانن سوود لەچەند کەناڵێکی یوتووب ببینن سەبارەت بەم باسە وەک کەناڵەکانی : (ختلة ، على الفطرة ، وثائقية احداث وحقائق روايات) ، وآخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين .